# فەرهەنگی کوردەواری

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

هۆشیار نوری لەک

ئامادەکردنی : هوشیار نوری لەك

# زنجیرە کتێبی نواڵەی نوێ

ژمارە (٨٣) ساڵی ٢٠٠٨

خاوەنی ئیمتیاز
هۆشیار نوری لەك
٤٦٢٥١٦٩

سەرنووسەر
ئاری ئاغۆك
٧٤٥٧٧٧٦

ناوی کتێب: فەرهەنگی کوردەواری

بابەت : کەلەپوور

کۆکردنەوەی و ئامادەکردن: هۆشیار نوری لەك

نەخشەسازی و بەرگ: نووسینگەی (هیوا)

چاپ : چاپخانەی ( چوار چرا )

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

بەرگی یەکەم – چاپی یەکەم – هەولێر / ٢٠٠٨

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ١١١ ) ساڵی ( ٢٠٠٨ )ی دراوەتێ

لەسەر ئەرکی
سەنتەری رۆشنبیری بەهرە
بەچاپ گەیاندراوە

بەناوی یەزدانی باڵا دەست

# پێشەکی

شوناسنامەی نەتەوایەتی راستەقینەی هەر میللەتێك لەفۆلکلۆرو کەلەپوورەکەیدایە، (کورد)یش یەکێکە لەمیللەتە زیندوەکانی سەر رووی ئەم زەمینە پان وبەرینە، کە خودان گەنجینەیەکی دەوڵەمەندو لەبن نەهاتووە، کەلتوورێکی رەسەن‌و (دابو نەریت)ێکی تایبەتی هەیە.

نەتەوەی کورد.. ناسنامەی نەتەوایەتی راستەقینە خۆی لەناو کەلتوورەکەی دەدۆزێتەوەو ونی ناکا، تا ئەوکاتەی گرینگی دانیش بەکەلەپوورو کەلتوور لە ئارادا بێ، ئەوە گەلی کورد مێژووەکەی ناشێوێندرێ‌و کەسیش ناتوانێ دەرکی پێ ببات.

فۆلکلۆر پەروەران... خوێنەوارانی ئازیز..

هەڵبەتە پەنجەرە زۆرە لەبەردەم بایەخدانەکانی (گەنج) و (لاو)دا بەلام من پێم وایە (گەنج)و (لاو) هەرچەند خزمەت بە(ئەدەب) و (هونەر)ی نەتەوەکەی خۆیان بکات، دەبێ (هەوێنی) هەمە و باسەکانی لەکەلتوورەوە هەڵێنجابێ، چونکە وەکو باسمان کرد (شوسناسنامەی نەتەوایەتی) راستەقینەی ئێمە لەفۆلکلۆر دایە، کورد گووتەنی (گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێ) بۆیە گرنگی دانی منیش بەکەلەپوورو خۆتێکەڵ کردنەوە لەگەڵ بابو باپیرانم بۆ ئەو رەسەنایەتییە دەگەڕێتەوە، من ئەوکاتە خۆم بە رۆڵەیەکی (شیر حەلالی) ئەو نەتەوەیە دەزانم کەخزمەت بە کەلتوورەکەی بکەم، ئەو بەرهەمەی لەبەردەستتان دایەو دیدەنتانی رۆشنکرۆدتەوە نێوی (فەرهەنگی کوردەوارییە).

ناوەرۆکی بەرهەمەکە بریتییە لە پێناسە کردن‌و لێکدانەوەی مانای زۆربەی زۆری ئەوشتەکەلەپوورییانەو وشەو زاراوانەی کەکاتی خۆی لەگوندو دێهاتەکان پێی دواوون‌و بەکاریان هێناوە ، بەئومێدم سوودی گشتی هەبێت‌و توانیبێتم خزمەتێك بەرەسەنایەتی نەتەوەکەم بکەم، پێتان دەڵێم خەرمان بەرەکەت.

هۆشیار نوری لەك / ٢٠٠٨

| پیتی (ئـ) | |
|---|---|
| ئەستێ و بەرد | جۆرە پۆڵایەکە لەبەردەئەستێ دەدرێ کە بەردێکی سەختی سپییە ئەو بریسکەی بەهۆی لێدانی چەخماخەوە لە بەردەکە پەیدا ئەبێ، ئەدات لە(پیفو)ە کەئاگر ئەسێنێو دائەگرسێت، جاران کەشخاتە نەبوو بەوجۆرە ئەبوایە ئاگر دەستگیر ئەدەبوو، هەتاتفەنگی ڕەشۆکی دارانیشی بەئەستی و بەرد ئاگر ئەدراو ئەتەقی. |
| ئەقرەبە | ئەو ئاسنە شیشەییەیە کەقۆلێکی خوار کراوەی چەشنی کلکی دوو پشکی هەیە، لەناوەڕاستی دار (ئەقرەبە) بەکلکێکی ئاسنە تیژی دووسەر بەند بووەو چەمایتەوە. |
| ئێچك | دارێکی لووسی کەوانەییە، بەسەری کەژیەوە بۆ بەستان بەکاردێت |
| ئاخوڕ | بریتییە لەدیوارێ تا پشتێنە بەرز لەسەرەوە چاڵ بە قوڕوخشت دروست دەکرێ ئالف و ئالێکی تێدەکرێ بۆ ئەوەی وڵاخی بەرزە لەسەری بلەوەڕێت. |
| ئالیك | بەخواردنی ئاژەڵ دەگوترێ ئالیك. |
| ئەستەویر | هەر ئاژەڵێکی (مێیە) کەساڵێك نەزابێ، پێ دەگوترێ (ئەسەویر) تا ئاوس نەبێ بەستەویر دەمێنێتەوە. |
| ئاغا بان | بەخانوودك دەگوترێ، بانەکەی تەخت سەرەکەی بەخۆڵ یاقووڕ پەست ترابێت، لەبەرامبەری خانی جەزیری هەیە. |
| ئاو خۆرموە | کەسێکە لەدێدا کاری جوتیاری نەبێت. |

| | |
|---|---|
| **ئایەغ** | خراپ، قرپۆك. |
| **ئاومرت** | رووتکردنەوە. |
| **ئۆبار (ئۆبال)** | شکاندنەوەی بەسەرمل تاوانبار کردن. |
| **ئاه** | لەئاهی من خودا هەرت پڕوکێنێ. |
| **ئۆغربی** | کێو دەچیت (تورکیە). |
| **ئاژینە** | چەق چەقەی ئاش، بریتییە لەو دارەی بەستراوە، بە کەویچەوە لەگەڵ گەرانی بەرداش دا وردە(دان) دەوەرێنێتە ناو گەرووی بەرداش بۆ هارین. |
| **ئەستون** | ئەوداره درێژانەی کەرەشالی لەسەر رادەوستێ پێی دەڵێن ئەستون. |
| **ئاردە بارە** | بریتییە لەوئەندازە ئاردە لەپاش هارینی باراش ئەدرێ بەئاشەوان. |
| **ئەنگوستەچاو** | بەوتاریکی یە دەڵێن ئەنگوست لەچاوت رانەچێ نابینی. |
| **ئاردە برنج** | ئاردێکە لەبرنج پەیدا ئەبێ، بەهۆی کوتاندنیەوە. |
| **ئاردە ساوار** | ساواری زۆر وردە. |
| **ئاردە توو** | ئاردی تووی کوتراوو بێژرا. |
| **ئاری نۆك** | لەتکە نۆکە لەزۆر شوێن لەگەڵ برنج تێکەڵ دەکرێت و لێدەنرێت. |
| **ئاقار** | زەوی زار. |
| **ئامان** | دادوهاوار. |
| **ئەلعانەکە** | ئێستاکە. |

| | |
|---|---|
| ئەکانی | کوانی، لەکوێ یە. |
| ئیدی | ئینجا، ئەوجا. |
| ئەشك | رۆندك، فرمێسك و ئەسرین. |
| ئاودیو | لەودیو، لەولا بۆ ئەولا. |
| ئەنگافت | پێکاولێدراو. |
| ئەنگۆ | ئێوە. |
| ئیلاقە | پەیوەندی. |
| ئەز | من. |
| ئاکار | ئەخلاق، رەوشت. |
| ئامێز | باوەش. |
| ئایاغ | خراپ، قەپۆك. |
| ئاور | ئاگر. |
| ئاوزنگ | پریشکی ئاگر، بریسکانەوە، خوناوی سەرگیاو رووەك. |
| ئاونگ | شەونم. |
| ئاوەڵا | کراوە. |
| ئیخە | پەخە. |
| ئاخ | خۆڵ، گڵ، خاك. |
| ئوردی | بارەگای لەشکر. |
| ئۆقرە | سرەوت، ئارام. |
| ئاو قەران | ئاو قوف، هاوتەمەن، ئاوزە، هاوزە، هەندی یەك، بارتەقا . |
| ئەتوو | توو، ئەتۆ، ئەهـ، تۆ. |

| | |
|---|---|
| ئازای | سەرتاپای، هەموو، تێکڕا، (ئازای لەشی لێکڕا هەژا). |
| ئەستوورک | کولێرە، نانی ئەستوور. |
| ئۆمەر | بە کەسێك یان پیاوێك دەگوترێ کە هەردەم لە ماڵەوە دەستە و نەزەر بێ. |
| ئەو محەلانە | کات، وەخت، سات، ئەو محەلانە، ئەو وەختانە. |
| ئاوت لۆ رژایە | هەموو شتێکی بۆ مەیسەر بووە، کینایەیە بۆ کەسێك کە کەسێکی دیکە نەتوانێ دەست لەبەر دەستی هەڵبدا، بۆی چویتە سەری. |
| ئەلفاز | لە فززەوە هاتووە، قسە کردن، (لە ترسان ئەلفازی نەگەڕا). |
| ئاوکوف | هاوتەمەن، ئاوزە، هاوگوف. |
| ئۆیین | نزم، بەزم، کێشە، مەکرباز، جەمباز، فرت و فێڵ. |
| ئەسپێ کوژە | هەردوو پەنجەی گەورە. |
| ئایری | جوایەز، جیاواز، ئایەغ. |
| ئەستێرك | سەکۆی خشت یان لە دار دروستکراو، ئەو شوێنەیە کە لە ژوورەوەی ماڵەوە (بنەبانێ) بە بەرزی گەزێك بڵند دروست دەکراو سەری بە دار دەگیراو(جاجم، مافور، لباد، نوێنی) لەسەر دادەنرا لە ژێرەوەش کەل و پەلی زیادی لێ هەڵدەگیرا. |
| ئەسکورد | ئەستۆ، گەردن، مل، کلیلەی مل، ڕێسەی مل. |
| ئیستیفراق | هەڵاوێتن، ڕشانەوە. |
| ئاوقات | زۆرزان، دانا، زانا، پارێزەر. |
| ئورقوم | قرپەقەپ، بێ دەنگی، قسەنەکردن، (ئورقومی لێوەنەهات). |

| پیتی (ب) | |
|---|---|
| **بالینگان** | ئەو وشەیە لەگەڵ جێی دێت، جێی بالینگان ئەو نوێنەیە راخرابێت. |
| **بەراگێر** | بەقوربان. |
| **بێ بەری** | بێبەش. |
| **بەرغەبابە** | ئەوگۆشتەی لەژێر چەناگەی مرۆڤ شۆڕدەبێتەوە . |
| **بزنۆك** | داریچکە دەخرێتە ناو دەوی کارو بەرخ تا داکیان نەمژن. |
| **باقژە** | کولێکێکی سوورەو لەکولێکە مێلاقە بچووکترەو پەڕی وەك ئەو ئەستوور نابێت. |
| **بنکڕ** | ئەوبرنجەی بەبن مەنجەڵەوە نووساوەو ردق بووە. |
| **بەرچیغ** | ئەو دارەیە کەدەدرێتە بەرەچیغی رەشماڵ، زۆر شیاوە بۆ شەرکردن. |
| **باقۆ** | کارو بەرخێکە لەساوایی تێرشیر نەبووبن و بەژن گچکەو بێ هێزو زگیان گەورە. |
| **بالیفۆکەی خوا** | کرمێکی رەنگاو رەنگ و نەرمە. |
| **بزمووك** | (بزمك، بلامك) پەلە دارێکی بچووکەو هەردوو سەری بەنی پێوە بەستراوەو.. وەك لغاو لەدەمی کاردەکرێت، تاکو نەتوانێت دایکی بمژێت. |
| **بندۆك (دۆك)** | کەفەژیلەکەیەکی سپییە لەکاتی دوانەوەی ( کەمەر: ) سەردەکەوێت. |

| | |
|---|---|
| بانۆك | کەسێکە ئاژەڵی نەبان لەسەر بێچوی خۆی یان لایدا ببانێتەوە. |
| بەگژداچوون | پیاهەڵشاخان. |
| بنکەوێ | کورتەکی ژنان. |
| بەڕوولە | تیژکردنەوەی نووکی (گاسن)ی جووت دوای کول بوونی پێدەڵێن (بەروولە). |
| بەراویشتە (بەراویتە) | ئاژەڵێکە بێچووی لەبەر چووبێت. |
| بەربوارد | مەڕو بزنێکە بێچووی یەکەمیان بەڕێ کردبێت. |
| بەردیل | سپیانی مێی تەمەنی گەیشتبێتە ساڵو نیوود تادەشزێت بەرددیل پێدەڵێن. |
| بەلەچەك | گندۆرەو کودیو... وشك کراوە. |
| بۆسە (وێژانبەر) | زەنگۆڵ (قەفیز)ێکی داودو بەهێرتەوە شۆربۆتەوەو سەری مژانەی لێقایم دەکرێت. |
| بەربۆسە | پەلەدارێکی بەقەدەر دوو پەنجە پانەو لەناوەڕاستی بۆسەی دراوەو سەری گیانجە (مژانە) راگیردەکات. |
| بزڕکان | تێکچوونی شیر. |
| بنکێش | جۆرە دروومانێکی سادەیە. |
| بێوکە | زندەوەرێکی زۆر بچووکەو لەئاسنو دار دەداتو دەیخوات. |
| بەرە مەشکە | (کەرە)ی هەژاندنی مەشکەی رۆژانە. |
| بنۆك | قرپۆکی خوریو مووی لەشانەدراوە. |

| | |
|---|---|
| بۆگە | گیایێکە لەدەو چرکاوان دەڕوێو بۆنی ناخۆشی لێدێت، هەروی ئەو گیایەی پێخوستی لەسەر بێت، مەڕو بزنیش ئەم گیایانە ناخۆن. |
| بڕك | ١- بڕکی سەوزە وەك بڕکەتەماتە بڕکە گندۆرە.<br>٢- تەنکاو، ئەوشوێنەیە لەرووبار قوڵ نەبێتو مرۆڤ بتوانێت لێیێ دەربازبێت. |
| بەند | ئەو کاریزانەی نزیك سەرچاوەکەیەتی کاتێك لەوێ وە دەرمان تێدەکەنو بۆ راوەماسی تا ماسیەکان بۆ سەروچاوە بێنەخوار بەم کاریزانە دەوترێت بەند. |
| باروبوو | یارمەتی، کۆمەك. |
| بستی | گرد، زوورگ. |
| باخۆش | هەراش. |
| بەرباد | بەر(بەد) یابەر +باد (با) لە بەر بای دەڕوا واتە خراپو بێ کەلك. |
| بەکۆر | بەکول، بەتوندی. |
| بەراگێر | بەقوربان. |
| بێزەومر بوون | پیس بوون، قێزەوەر. |
| بەرزەفت | جوڵە لێ بڕین. بەرزەفتی کرد نەیهێشتن بجوڵێتەوە. |
| بن پشك | کچێکی تەمەن گچکە لەبڕی کچێك کەبەمێرد دەدرێتو مارە دەکرێت. |
| بەرەشنك | بەدەمچە، بەری رووەکی شواشینك. |
| بنەوشە | بیمۆك، بنەڤش، جۆرە قەزوانێکی وردو نەرمە. |
| باوێ | پاڤێژە، هەڵیدەو، بهاوێژە. |
| بێز | نەویستن، قێز. |

| | |
|---|---|
| **بێزموەر** | قێزەوەر، راگێڕدراو، پیسبوون، پلتۆخ. |
| **باغەر** | بەشۆڕکردنەوەی کراسی ئافرەتانی کورد لەکەمەرتاسەرچۆک باغەرو دامەنی یەکە. |
| **بووره** | بەو زەوییە کەساڵێك بێت نەکێڵ درابێت. |
| **بەڕووله** | تیژی ونووکی گاسنە کەخورابێ، لەکوورە سەرلەنوێ تیژی دەکەنەوە و نووکی درێژ دەکەن، بەم کردارە دەڵێن گاسنەکە بەڕوولەیە، بەبێ زیادکردنی ئاسن. |
| **بەربۆسه** | بەودارە دەڵێن کەلەلای سەرەوەی زەنگۆڵە (بۆسە) دەدرێ و بۆ سەکە دەکاتە دووبەش و سەرمژانە کەرادەگرێ لەکاتی راکێشانی هەوجارەکە. |
| **بەنگراوه** | لەهەر پەڕگەدار کراوەکان بەنێکی گشتی هونراوە هەیە، لەچەشنی نیوە گوریسێکی باریکی بەسایەی لەلەکەی خواردوە بەدارکراوەکان بەستراوە بۆ قایم و بەستنەوەی هەردوودار کراوەکە بەکاردێت. |
| **بزمووك (بزمك، برامك)** | پەلەدارێکی بچووکە و هەردوو سەری بەنی پێوە بەستاوەو وەك لخاو لەوەوی کاردەکرێت تاکو نەتوانێت دایکی بمژێت. |
| **بن مل** | گوتنەکەی بن ملە، بەڵام لەسەر ملی ولاغ دادەنرێت، رووێکی پارچە جلێکە لەکۆنە لباد بەچەند قەد بەیەکەوە دەدوورن، رووەکەی تری لەقایش و لاستیك پێکدێت، نابێ لەسێ پارچە کەمتر بخرێتە سەریەك لەبەر مەترسی و بریندارکردنی ملی ولاغ. |

| | |
|---|---|
| بەستەکی جەنجەر | بەو گوریسە درێژە دەڵێ، کە هەر چوار دەوری جەنجەڕێ پێدەبەستنەوە، بۆ ئەوەی جەنجەڕەکە لەبارێک نەچێ والێکهەڵنەوەشێتەوە لەکاتێ کارکردنا. |
| بەستەکی شەغرە | بەونیوە گوریسە باریکە دەڵێن کەهەردووپێچکە شەغرەی لاپەڕدگەی پێ دەبەسترێتەوەو توند بنەتەك دەدرێ، بەسایەی داربەستەك بۆ ئەوەی لەگڕگرەکە نەترازێ ودانەکەڵێ. |
| بیرۆك | لەچەشنی خاکەناسە، بەڵام دەمەکەی لووس و پانەو دەسکێکی بەقەدەر دەسکی شەنەی هەیە، لەداریش دروست دەکرێت. |
| بن جۆخین | خڕکردنەوەی خاكو خۆڵی بن جوخینە بەبای دەکەی، (سەرەند)و (بێژینگی) دەکەنو دانەکەی خاوێن دەکەنەوە. |
| بەرکۆت | ساڵ وادەبێت نەبوونی ونەهات دەبێ، برای وەرزێر باراشی نامێنی، چەند شەغرە یەك لە(گەنم)یا(جۆ) وەیا (گەنم و جۆ مزاش) وپێش جۆخین دانان دەیکوتێو گەنمەکەی دەکاتە ئاردو دەخوات بەم کارە دەڵێن(بەرکۆت). |
| بەن قادە | بریتییە لەو دوونیوە گوریسەی کەلەباڵێك هەتا دووبال درێژ دەبێت، لەدوو پێچکەی شەغرە دەپێچرێ، هەر دووسەرەکانی لەسەرەکانی(مادە) کەدەبەسترێ و دەبێتە بنچینەو جێی باوەشی قرشە. |
| بەردەسێر | پارچە تەنەکەیەکی کون کونە دەخرێتە سەر سێ کوچکە، ئاگری لەبن دەکرێتەوەو ناوە ناوە(کا)ی بەسەر دەپرژێنن. |

| | |
|---|---|
| بێژەبا | بەباکردنی دەغڵو دانە بۆ جیاکردنەوەی کوزروتۆزو خۆڵ، بەسایەی (بێژۆک). |
| بەیاربڕ | بەوپارچە زەویە دەڵێن کە یەکەم کاسنی لێ دەدرێ، دەڵێن فلانە زەوی بەیار بڕی فلانە کەسییە. |
| بەر | دابڕینی پارچەیەک لەتەباردیە بۆ دوورین. |
| بەلالوک | دەرختێکی کێوییە، زۆر بەرزنابێ گەڵا وردی دڕکاوییە، بەرەکەی ئەخورێت وردەو رەنگاو رەنگ وەکو گێلاس، ناوەکەکەی زۆر خێرایە بۆ رەوانی. |
| باراش | بەوگەنم و جۆیە خاوێن کراوە دەڵێن کەبۆلی کردنو نانی ساڵی دانرایە. |
| بژار | بریتییە لە هەڵوەراندنو لابردنی گژوگیای خراپ کە زیان بەخش بی لەناو کشت وکاڵ دا بەتایبەتی(زیوان). |
| بەردکێشی | بریتییە لەدووپارچە لەتەختەدار دروست کراون، ئەخرێنە سەر پشتی (گوێدرێژ) بۆ بەردوخشت کێشان. |
| بەرامپیل | بەرهەڵبێنە بریتییە لە پارچە قوماشێکی رەش لاکێشە، یاچوار گۆشە دەبێت ئافرەت راستوچۆپ لەملی خۆی بکات، رووەکەی دەکەوێتە پێشەوەیی ئافرەتەکە، لەکاتی هەوێزماڵێن، شت بەباکردنو قورکاریو کاکێشانەوە بەکاری دەهێنێ، بۆ پاکو خاوێنی جلو بەرگیان (بەرامپل) یان دپۆشی. |
| بەردەقانی | قۆچەقەنانی شتێکە لەبەن چنراو، بەقەد ناولەپێ پان ودرێژەو هەردووسەری رووشتپەی پێوەیە، پاسەوانی پاساریو چۆلەکەی پێ دەکرێت لەسەر مەرەزە لەباتی چەک. |

| | |
|---|---|
| **بێژینگ** | لەدارکەوت دروست دەکرێت، کەبلَندیەکەی بەقەدەر، پێنج پەنجە دەبێت، تیرەکەی ناوەوەی نزیکەی (٥٠) سانتیمەتر دەبێت، شێوەی بازنییەیە، بنەکەش بەداوە(سیرمە) پرولەپالَ یەك بەڕاست وچەپ تێپەڕیووەو دروست کراوە، هەموو کون کونە بۆ بێژینگدانی دەغل ودان بەکاردێتو زیخو زیوان و بەردە هوردەی لێ رزگار دەکات، سەردار کەوت دروست دەکرێ. |
| **بەنتك** | لەقەنەفلَو سۆتکەو زەنگیانە دروست دەکرێ، ئافرەت بەیەقەی کۆمەلَە جەبانەوەی دەخەن بۆ جوانی. |
| **بەرمەشکە** | ئەورۆنەیە کەلە ژەندەنی مەشکە دەردهێندرێ، هەژاندنی مەشکە رۆژانە. |
| **بەربووك** | بەوژنە دەلَێ، کەلەسەینو بەینی بووك دێ و دەچێت، رۆژێك وەیا دوو رۆژ خەریکی رازانەوەو رێخستنی بووکە. |
| **بەفرە چالَ** | چالَە بەفر، چالَێکە قوَلَە هەلَ ئەکەندرێت لەزستاندا پڕ دەکرێت لەبەفر، لەچیاکاندا لەپاش کوتانەوەدەو داپۆشینی بەپووش وپالَاش وهەژگ تالە هاویندا سوودی لێ وەربگرێت وبەکاربهێنرێت. |
| **بەفرە خۆرکە** | هەورێکی تۆزی لێنەبارێت نەبێت بەهۆی توانەوەی بەفر. |
| **بنێلە** | برتییە لەفرێدانی کولَوش خەرمانی بۆ ژێر پێ گا جووتی گێرە، لەرووی ناوی خەرمانەوە بۆ لای دەرەوە بۆ ئەوەی باش و وردی بکات وبیکوتی. |

| | |
|---|---|
| بنوانی- ئاوی سەرچاوە | بریتییە لەسەرچاوەی جۆگا، لەوێدا بەستێ ئەبەسترێ لە بەردەمی ئاودا (کانی) بێ یا (چەم) ئاوەکە بەهۆی ئەو بەستەوە بەرز دەبێتەوە بەجۆگادا دەچێت بۆ سەر کشتوکاڵ. |
| بەردەبێر | بەردێك کەبۆ مەڕدۆشین شوان دابنشێ لەسەری. |
| باوەخوون | کاتێ بووك یەکەم جار دەچێتەوە ماڵە باوکی لەپاش گواستنەوەی. |
| بێری | ژنە مەڕ دۆش. |
| بازنی شاخ | ئەوبازنە وەکو دار وایە، بەڵام ڕەنگی ڕەشی نەخشدار بوو، ئەویش لەبەقاڵ دەکڕا. |
| بازنی باسك | ئەوبازنەش لەهی دەست گەورەتر بوو، لەباسکی خۆیان دەکرد، ئەمەش هەر لەدیوەردو بەقال دەیان کڕی، چکە جاحێلی گوندی لەباسکی خۆیان دەکرد، بازن لەناوگۆشتی باسکی ختم دەبوو ئەوەندە جوان بوو. |
| باڵتە | (پەڕ) لەهەندێك شوێن بەتۆپەدارەکەو ئاسنەتیژەکانو پەڕەکان دەڵێ، باڵتە، لەهەندێ شوێنی تر تەنها بەوپەڕە تیژانە دەڵێن کەبەندن بەپاسایەی ئەوکلکە ئاسنانانەی خۆریان، لەتۆپەدارکەوە پاچاینەوە، بۆ شکاندنو کۆتایی قرشە بەکاردێن. |
| بەڵەك پێچ | بەلەك پێچ لەوەرزی زستان لەسەر شەڕواڵ لەبەلەکی خۆیان دەپێچا، زۆر گەردم بوو لەخوری دروست دەکرا. |
| بەڵەك | چاوێکی ڕەشینکەی زۆر ڕەشبێ وسپیەکەی زۆر سپی بێ |
| باسخۆز | گەمارۆ. |

| | |
|---|---|
| بەقا | بڕوا، ئومێد. |
| بڵاوە | پەرت بوون. |
| بەحری | دەریایی. |
| بەران | بەڵام، بەڵان، (بەران/ بەنێرینەی مەریش دەوترێ). |
| باوێ | بهاوێ. |
| بڕشت | توانا. |
| بەستێن | لێوار، کەنار، قەراغ. |
| بژوێن | شوێن گیاوگۆڵی زۆر. |
| بەتیە | وەکو عەبایە، لەمەرەز دروست دەکرێت، تەنکە لەسەرجل‌و بەرگ گەورە پیاوان لەبەریان دەکرد. |
| بەرمەشکە | ئەو رونەیە کەلەوژەندنی مەشکە دەردەهێندرێ. |
| بەردەبێر | بەردێك کەبۆمەڕدۆشین شوان لەسەری دابنشێ. |
| بووکی سارێ | بوکێك کەساڵێك هاتبێ. |
| بەرخستن | لەبار چوونی منداڵ، یاساوا بەناکامی‌و مردووی. |
| باڵە شۆڕی | جۆرە نەخۆشیەکە تووشی، ( مریشك) دەبێ باڵەکانی شۆڕدەکات. |
| بۆز | ماش‌و برنج، ڕەش‌و سپی بەتێکەڵاوی. |
| بەرەمار | بەغیرەت، ئازا، رەشید، زیت. |
| بەئەمەك | شیر حەلال، لاوچاك. |
| بەتەبایی | بەرێك وپێکی لەگەڵ یەك. |
| بێ وچاغ | بێنەوە، بێ مناڵ. |
| بەزەبری | بەهێزی. |

| | |
|---|---|
| بەجەم | بەهێز. |
| ببڕای ببڕ نایینیتەوە | جارێکی تر نایبینیتەوە. |
| باژۆن | لێخوڕن. |
| بزربوون | ون بوون. |
| بەبەر | هەردرەختێ بەری هەبێ. |
| ببێن لێدان | پێشودان، فروقوم لێدان. |
| بمەیی | توندبێ، یەکتر بگرێ. |
| بەحەژمەتی | بەحەزی، بەئارەزووی / بێ ئارامی. |
| بێ برشت | کەم بەرەکەت، کەم بەرهەم. |
| بێ مراد | نەگەیشتن بەئاوات. |
| بەرژەوەند | قازانج، مەسلەحەت. |
| بۆن کرۆز | بۆنی سوتاندنی خوریە. |
| بەکاوەخۆ | بێ پەلەکردن لەسەرەخۆ، هێدی. |
| بارتەقا | بەقەدەر، هەندێ. |
| باوەش | ئامێز. |
| بێشکە | لانك. |
| بن گەڕ | ژێر کەندەلان. |
| باراش بڕ | باراش لێبراو، گەنم و جۆ بڕاو، نان بڕاو. |
| بەقا | بڕوا، ئومێد. |
| باست | خەبەر، دەنگ و باس، هەواڵ. |

| | |
|---|---|
| **بەدەن** | لەش، بالآ، بەژن. |
| **بتوقێ** | گیان دەرچوون، ترسێکی گەورە. |
| **بەشارەت** | مزگێنی، خۆش/ مژدە. |
| **بنگەچی** | هوردە ساواری ژێر گۆش. |
| **باتمان** | شەش هۆقەیە، دوانزە کیلۆیە. |
| **باربوو** | یارمەتی، دەست گرتن. |
| **بەخۆکەوە** | ئامادەبە. |
| **بریا** | خۆزگە. |
| **بەچکە** | منداڵ. |
| **بسك** | زولف. |
| **بشەتێنە** | توندبکە. |
| **بەکوتکی** | بەخورتی، بەزۆری. |
| **بادام** | باوی. |
| **بە قاڵۆیەك** | قاڵۆ، شەقاو، هەنگاو. |
| **بێـــــژینگ بەسەر** | بەریزترین ترۆپکە لە چیای بلْباسان (قەرەچوغ) چیای قەرەچوغ، کە هەردوو دەشتی کەندیناوە و قەراج لێکدی جیا دەکاتەوە، لە دوو بەش پێکهاتوو، یەکەمیان (بلْباسان) ئەوی دیکەش (مامە رووتە)، هەرچی قەرەچوغە ناوێکی سەپێندراوە. |
| **بنی قسان** | بـن کۆتـایی، بنـی قسـان، دوایـی بـە قسـان هێنـا، هـەموو قسەکانی بریەوە. |
| **بێ نموود** | بێ پێز، گچکەڵەیی، سیس هەڵگەڕاو، لاواز، لەڕ و ناپووت. |
| **بە هەوەنتە** | بەلاش، لە خۆڕا، بەبێ نرخ. |

| | |
|---|---|
| بیلبتوون | هـەموویان، سـەرجەمیان، تـەواویان، تێکڕایـان (منداڵـەکان بیلبتوون نووستون). |
| بارزقە | فرچکە، بۆ خوێن بەربوون بەکار دێ. |
| بۆمزیری | مزیری، خراپە کاری، تێکدان، بەدکاری. |
| بە تەوسەوە | بە گاڵتەوە، بە تیزەوە، بە تانەوە. |
| بڕوانێ | سەیرکە، بنواڕە، تەماشەکە، زەین بدێ. |
| بە بارە باڕ | بە ئاشکرا، بە سۆرە سۆر. |
| بێ متەق | بێ قسـە، بێ گفت، بێ ورتە، قڕ و قەپ، بێ دەنگ. |
| بۆ گارِدانی | بۆ بەشداری کردنی، بۆ تێوەردانی. |
| بەناگوزیری | ناگوزور، کەم و کورتی، نەبوونی، بێ دەرامەتی، فەقیر. |
| بستی | گـرد، بـەرزایی، شـوێنی بڵنـد، (عولاّغـا یـەك رکێـب بەسـەر بستیەکە هەڵگەڕا). |
| بەرامپیل | بەرهەڵبێنە، لە چارۆکە بچوکترە، بۆ گواسـتنەوەی کـەل و پـەل بەکاردێ. |
| بە حیددە | حیددەت، هێز، قوەت، توانا. |
| بن خەلانکە | خەلانکە، کون، دەلاقە، پەنا. |
| بافرە | خۆشی، کامـەرانی، شـادی، فـەرەحنایی، (کـە زانـی نـەگیراوە بافرەی سەرفرازی هاتێ). |
| بەزگ دان | لە خەفەتان مردن لە خەمان مردن، مردن لە سوێین. |
| بابۆلە | نانی لوولدراو، نوردی، پارووی گەورە. |
| باریکە | باسـکە، ملە کێو. |
| باڕ | جوجەڵەی چوار مانگ، فڕوج کە هێشتان بە هێلکە نەهاتبن. |

| | |
|---|---|
| بینێك | کاتێك، ساتێك، وەختێك، بینێك سەرنجی لە دەم و چاوی دا). |
| بە بارە بارِ | بە ئاشکرا، بە زۆری زۆرداری، بە هارە هارِ. |
| بەردیلە زەکات | بەردیل، کەمەرِ دەزێ بەرخی دەبێ پاشان دەبێتە کاورِ، پاشان بەردیل، پاشان بەر بوارد، بەو بەردیلە دەڵێن کە مەرِدار بۆ زەکاتی مەلای گوندی داناوە. |
| بەیار | زەوی نەکێڵدراو، تۆ نەکراو بۆ یەك ساڵ، بەو زەوییە دەڵێن کە هیچ نەکێڵدرابێ، یان کۆێکی تۆکردنی بەسەردا تێپەرِ ببێ. |
| بوور | بەو زەویە کێڵدراوە دەگوترێ کە دوو گاسنی لێدرابێ شۆبرِابێ وەرد درابێتەوە، بەڵام تۆ نەکراوە. |
| بێ قونەبان | بێ ئۆقرە، بێ توتکە، بە کەسێك دەڵێن کە لە شوێنێك ئۆقرە نەگرێ و بەردەوام جێ گۆرکێ بکات. |
| بافرە | خۆشی، فەرەحنایی، سوکنایەتی. |
| بە حەیرمانەوە | حەیرمان، سەرسورِمان، عەجایب. |
| بزمووك | پارچە داروچکەیەك بوو بە قەدەر پەنجەی بچوك، لە دەوری کاروبەرخی ساوا بە بەنێك گرێدەدرا تاکو نەتوانێ گوانی دایکی بمژێ. |
| بەرِك | بەری، باخەڵ، گیرفان. |
| برِێك | تۆزێك، قیچێك، نەختێك، هەندێك، پیچەك. |
| بن مل | ئەو پارچە لبادە یان بەرِە لێکدراوەیە کە لەسەر ملی وڵاخ دادەنرێ لەکاتی جووت کردن یان خەنجەر کرکردن، نیر و کۆپەڵانی دەکەوێتە سەر. |
| بەروەستی دێ | دەرەقەتی دێ، لەهەقی دێ. |

| | |
|---|---|
| بووزی | شال لە مووی مەرەز دروست کرابێ، پارچە قوماشێك یان پەڕۆیەکی (دڕ) زبر. |
| بەلەکار | بزنی گوێ لول. |
| بەرە جۆت | ئەو پارچە زەویەیە کە جوتیار توانای ساخبێری کردنی هەبێت. |
| بەردی گەرم | بەختی باش(ئامرازی تەمەنایە). |
| بکورکێتەوە | گریانی لەسەرەخۆ. |
| بەرشەق | قەد بڕ، یەکڕاست. |
| باریکـــــانی دەڕست | کزوبێحدوور، بێ هێزو لاواز، دەبنــا، سیس هەڵگەڕان، ڕەق و لاواز هەڵگەڕان. |
| بەلەدی | شارەزا، لێزان. |
| ببرینگێنێت | بروسکە بدات، (هەور زگی لە عەرد ناوەو دەبرینگێنێت). |
| بە فیتی | بەقسەی، هاندان، بەهانی. |
| بنیشتە شینکە | بنیشتە خ ِشکە. |
| بۆرە تەمایەکی | بۆرە ئومێدێك، یارم هیوایەك، نیازۆکەك. |
| بەجاوەجاو | بە پاڕانەوە، بە ناورانەوە، زمانلووسی. |
| قاودا | دەرکـردن، بـە خـورتی بـارێ کـردن، وەدەرنـان لـە گونـدی، (وادەکەم ئاغا قاوتان بدات). |
| برینگ | وشك، بێ باران. |
| بە حیرس | نەفس بەرز. |
| بژیوان | ناوبژی کەر، مام ناوەندی. |
| بنگە | هەوارە بەهارە، بۆ لەوەڕی مەڕ و ماڵات شوانکارەی دەچنێ. |

| | |
|---|---|
| بقرسینن قرساندن | خەملاندن، تەخمین کردن، مەزەندە کردن. |
| بیْ حدوور | کز، لاواز، مەلوول، داماو، پووت، سیسی، رەق. |
| باراش | بەو گەنمە خاوێن کراوە دەڵێن کە بۆ لێکردن و نانی ساڵی داندرایە، ئەو گەنمە تاکو دەبێتە ئارد. |
| بنەچە | رەچەڵەك، ئاگردان، وچاغ، رەسەن، باپیران، ئەژداد؛ ئاجەڕات، بەردباب. |
| بەدیۆم | شووم. |
| بیـــــان بوغزێنە | بوغز، رق، قین، خۆشنەویستن. |
| بوغز لێدان | رق لێبوونەوە، خۆشنەویستن. |

| پیتی (پ) | |
|---|---|
| پسکە | نەخۆشییەکی ناژەڵەو.. وەك پەسیووە رووەکێکیش پێیدەڵێن (دارپسکە) گوایە رووەکەکە وەك میرو بەملی ناژەڵەکەوەبکرێت چاك دەبێتەوە. |
| پشتیر | تەویلە، هۆڵی ناژەڵان. |
| پەرخۆڕ | لەودرو نالیکی نێو ورگی ناژەڵ، کەهێشتا تەواو هەرس (هەزم) نەکرابێت. |
| پەرکۆ | کوتانی ساواری خڕ تاکو پەلکە تەنکەکەی تەواو بەردەدات. |
| پەستەك | وەك کەرك وایە، بەڵام لەمەرز دروست دەکرێت. نەك (لوا) لەدەشتی هەولێر لەپەرۆش درووست دەکراو پێداگوترا (غەرگە). |
| پتر | زیاتر، زۆر زۆر، گەلەك. |
| پۆقلە | دوای ئەوەی نان لەفڕنی یالەسەر سێڵ دەبرژێت، لەچەند جێیەکی هەڵدەستێت، جابەم هەڵستانە دەکوترێت پۆقلە، لەسەر شێوەی پفکەیە. |
| پفکە | پفکە زیاتر تووشی ناو لەپی پاڵەو نیشکەران دەبێت بەهۆی کارکردنیانەوە. |
| پشی هەرمان | هەناسە تەنگبوون، هەناسە هاتن بەزەحمەت. |
| پاراو | پاکردنەوەی بیر تاناوی زیاد بکات، بیرەکە پاراوەکی دەوێت (تیژناو. |

| | |
|---|---|
| پڕ پۆرە | خواردنێکە بۆجوولان ئامادە دەکرێت. |
| پەرکۆ | کۆتایی خەسار، مریشکەکە گەنمەکەی پەرکۆکرد. |
| پەپۆکە | لەدەشتی هەولێر بەتایبەتی لە قەراج ساڵەکی نەهات بوایە خەڵك مەحچەچەو جۆیان تێکەڵ دەکردو بەجۆنی دەیانکوتا دەیانکردە پەپۆکەو دەیانبرژاند. |
| پۆقلە | پفکە، زۆر لەکاتی ئازار پێگەیشتن دەست و پێ هەوا دەچێتە ژێر پێستەکەی و لەشێوەی دۆمبلان ئەم شوێنە هەڵدەستێت.دەستم هەمووی بووەتە پۆقلە لەبەر ئیشکردن. |
| پەنگاو | بڵاوبوونەوەی زیاتر بۆ ئاوو بۆن دەگوترێت بۆنەکە پەنگاوی داوە یا نەوەکە پەنگاوی دایەوە. |
| پاشۆل | بڕی نەوەندە شتەبوو کەنافرەتان دەیاغستە ناو بەرماميل.وەك پاشۆلەك قشپل. |
| پێیدەوێ | پێویستە، پێتڤییە. |
| پێ لەقە | لەقە، پێ. |
| پەلەواژ بۆوە | لەهۆش خۆی چوو، پەلەکانی بەرەو ئاسمان کرانەوە. |
| پرزەی لێ بری | هێزی لێبڕی. |
| پۆشتە | یەکێکە جلو بەرگی باشی لەبەر بێت. |
| پانك | گۆرەپان. کۆزە پانکە = گۆرەپانی کۆڕی مەڕی، پانکی . دزەییان= گۆرەپانێکە لەگوندی (گەرەوانی) خۆشناوەتی. |
| پەلەك | کەندو جۆم. |

| | |
|---|---|
| پای پیلان | بەئاردزووی خۆی، زۆر خەرج دەکات، بەپای پیلان پارەی خەرج دەکات. |
| پیسکە | مرۆڤی بێ نرخ، هیچو پوچ، قرچۆك. |
| پەلـــــەواژ بۆوە | کەوتە سەرپشتو پەلەکانی بەرزبوونەوە. |
| پێکۆر | پێکۆل، رِکە، سکۆڵ. |
| پەل | دەستو پێی ئاژەڵ، گرد، پارچەدار، ئەوەی رازو نهێنی پێ راناگیرێت دەوی پەلە، چەتوون، مردن مردنە ئەو پەل وەشاندنە چییە؟!. |
| پەرچەم | ئەوەندە پرچەی دێتە سەر نێو چەوان، جاران قاقۆڵی پێ دەگوترا. |
| پەرکەم | خوو، فێ. |
| پیك برە | ئەویش جۆرە کرمێکە لەگرێی سەرەوە دەدات، لەقەفی پیکەکە ئەوگرێی کەگوڵی لێ دەدەچێت دەبێتە هۆی وشك بوونی گوڵەکە پێی دەڵێن (پیك برە). |
| پەلەپیسە | کرمێکی رەشی بچووکە لەسەری پەلك کەکانی دەغڵ دەدات ودەیخوا پەلکەکان کورژو وشك دەبنەوە. |
| پەرە، پەڵە | گەیشتنی ئاوو تەرِایی باران بۆ بن زەوییە کێڵدراوەکە، بن کێڵگە گاسن، وەیا نزیکەی (٣٠) سم تەرِایی ئاو بچێتە بن کێڵگەو کێڵگەکە دەتاوێتەوە بۆ ماوەی(٦- ٧) رۆژ ساکی سپی لەعەرد پەیدا نابێ، وهەر رەشە پاش لی کردنەوە باران، |

| | |
|---|---|
| | وەیاشەربەلەباران پڕ ببێ، یانەگەڕێت لەناوکێلگەنا لە دوای پێ هەلگرتنت دەمو دەست ئاوی تێبچێ وپڕ بێت، وەیاجێی سمی ولاغیش پڕ بکات زۆر جاریش بەمە دەڵێن (پەرەی یاقوب ئاغا). |
| پاڵە | بەوکەسانە دەڵێن، کەبەرۆژانە کرێ پاڵەی دەکەنو دوورنە دەکەن، نەك بەمەرج و رێژەی رەوسەو سەپانی. |
| پێچکەی شەغرە | بریتییە لەچوار شەبکەی بەهێز مەیلەو دۆڵ و لەپارچە وشەق کردنی کورتە کاریتەکی دۆڵ (تەژە) هەرچوار سەرەکانیان بەیەکەوە بەندن بەسایەی دارێکی لوولەی زمانە دەرهێنراو نزیکەی (٥٠) سم دەبێت کەپێ دەڵێن (بەکرە). |
| پردۆکەی جەنجەڕ | بریتییە لەو دوودارەی کەهەردوو سەرەکانیان بەچوار گۆشەی وەیالاکێشەی کولدرایەو دەچێتە سەرسەری شونکی حوشترۆکە ئەویش هەر بۆ بەندکردنی جەنجەڕەکەیە. |
| پردی دانیشتن | ئەویش بریتییە لەلەوحە دارێك بەقەدەر بستێك زیاتر، کەمتر دەکەوێتە نێوان پرۆدکەی پاش پێشی جەنجەڕ بۆ دانیشتنی جەنجەڕوانە، درێژیەکشی بەقدەر بەرینی جەنجەڕەکەیە. |
| پێ وەرگێران | بریتییە لەوەرگێرانی ئەوقرش وقالەی بن پێی جەنجەڕو سراوبن بۆ کوتین. |
| پێ هەڵدانەوە | لەماوەی فرشەشکێن وکوتینی هوردە کوت پێی جەنجەڕ هەڵدەدرێتەوە لەقرشەشکێن بۆ لای راستو لە هوردە کوتیش بەلای چەپی جەنجەڕ. |

| | |
|---|---|
| پشت باڵ-بار | لەکاتی دەست باڵ گرتن دەبێت کەسێك هەبێت بۆ پشتباڵ کەهەردوو گوێچکەی تایەکە یاخراوەکە یافەردە یا جوارەکە بگرێت وتاوەکو بەپشت دا نەڕوات وبەرنەبێتەوە یارمەتی دەست باربەرەکان دەدات بۆ بارکردن. |
| بەرژین | دڕك و دارە لەدەوری باخچەو ڕەزادا دەچەقێنندرێ بۆ پاراستنی لەئاژەڵ بە دیواری پەلکەداریش دەڵێ، (بەرژین). |
| پیشەڤان | بۆشت لەزەوی هەڵکەندن بەکاردێت بەتایبەتی کەنگر، زارگە زەوی هتد. |
| پێناو | یەکێکە لەبەینی دووداڵدار هاتو چۆ دەکاتو بەیەکیان دەگێنێ. |
| پاچەکۆڵە | هەڵ کەندنی ئاوێراوی توتنو کشتوکاڵ ژێر درەختە بەپاچ. |
| پاکوت | پێشێل وەکو کوتانەوەو شێلانی سەربان بەپێی بۆ نەهێشتنی درزو برینی لەکاتی بارینی باراندا بۆ نەهێشتنی دڵۆپەوتکە. |
| پالاوتن | پالافتن وەکو شیریاکەرەی تەواوە بەهێلەگ یاشیر پالێوك بپالێورێت بۆ گرتنی پیسی و هەموو شتی زیادە. |
| پشت کۆڵ | دارێکە درێژ لەڕووی ناو ماڵەوە ئەدرێتە پشت قاپی بۆ زیاتر قایم بونی لەشەودا. |
| پشتەك | لەکاتی مەڕ برینەوە هەندێك بەران یاکاورە نێر خوری سەرپشتی نابڕێتەوە پێدەڵێن (پشتەك). |
| پەرێز | زەوی دوراوەیە لەگەنم و جۆ. |
| پوشانە | ئەو خەرج و باجەیە کەئاغا لەخاوەن ئاژەڵی دەستێنی لەساڵدا بەرامبەر بەو پووشەی ئاژەڵ خواردویەتی. |

| | |
|---|---|
| **پرپۆلە** | ئەو خواردەمەنییەیەکە لە(سەلکەو ئاردو ئاو) دروست دەکرێت بۆ مریشك. |
| **پارووی کۆجیلانی** | بەوپاروە دەلێن کە دەمەکەی فراوان و قوولە قونکەکەی باریکە بۆ ئەوەی ماستێکی زۆر هەلگرێ لەکاتی خواردنا. |
| **پەلەکوتە** | بەگێران ولەپ لەعەرددانی کەسێکی کوڕە لەپێشەخۆی وەیالەکاتی مردنی گیانلەبەرێك ویاکەسێك پەلەکوتە دەکات . |
| **پرتاو** | پەلەکردن، خێرا. |
| **پاچ** | خاکەناس، خاکەناز. |
| **پۆر** | باڵندەیەکی دەسییە لەدەوناوو لەناوگیادا دەژی. |
| **پاری داوە** | نووست، خەوت، درێژبوو. |
| **پسمام** | کوڕەمام. |
| **پیشەکار** | پیاوی لەبەر دەستەراوەستاو. |
| **پێش قەتار** | پێش کاروان، قافلە |
| **پێکۆرە** | رناندنەوەی زەوی بەپێ/ بۆ ولاّغ هاتووە. |
| **پێك** | لاسکی گەنمو جۆیە. |
| **پەرستیار** | ئافرەتی سەرپەرشتکاری نەخۆش |
| **پەسێو** | نەدیو، جێگایەك کەخۆی تێدا بشاردرێتەوە |
| **پیل** | لایەکی لەش لەشانەوە تاپەنجەی پێ . |
| **پرتاو** | پەرکردن خێرا. |

| | |
|---|---|
| پەڵەی یەعقوب ئاغای | بەو بارانە زۆرە دەڵێن کە چەند ڕۆژێك ببارێ و تەڕایی ئاو بگاتە (ئەلحەد)ی قەبری مردوان، هەروەها لەکاتی ڕۆیشتنی. ولاغی بەرزە شوێنی سمەکانی یەکسەر پڕش ئاو بن، گەلێ جاریش (پەڵەی قەبریش)ی پێ دەگوترێ . |
| پێشەڤان | مەساسە، لاپوتە، ئامرازێکی گیا هەڵکەندنە لە سەرێکی یەك بست درێژ و دەسکێکی داری یەك مەتر. |
| پفهەڵمان | توڕە بوون، دگە دگ. |
| پێك وەرموە | ئاشت بوونەوە، دەست لە دەست دان. |
| پشتەو شار | تۆڵە سەندنەوە، قەرەبوو کردنەوە. |
| پەڕەکەی ئاسمان | تاقی ئاسمان، حەفت تەبەقەی ئاسمان. |
| پاڵەوان | پشتیوانەی دیواری شکست، پشت بەستی دیوار، هەر کاتێك دیوار بۆ هەر لایەك لار ببوایە ئەوا پشت بەستی بۆ دەکرا کە پێی دەگوترت (پاڵەوانە). |
| پووش بەسەر | شاردنەوە، تەپس کردن، بێ دەنگی لێ کردن، (لە شەرمان نیشەکەی پووش بەسەر کرد). |
| پەڕەکەی وەرگێرا | باسەکەی گۆڕی، قسەکەی وەلانا، مەسەلەکەی ئاودیو کرد. |
| پێبلقە | قاندرمە، پەیژە، نێردەوانە، قالدرمە. |
| پڕ سۆ | پڕ ئێش، بە ئازار، خەمبار. |
| پێشاو | دەست بە ناو گەیاندن، چوونە سەرئاو. |

| | |
|---|---|
| پەنگاو | زۆربوونی ئاو، ئاوی راوەستاو. |
| پەرپووت | بێ خێر، لاواز، بێ کەلك. |
| پشوو | ئومێد، ئاوات، هیوا، (بە دیتنی پشووی هاتەوە بەرێ). |
| پلك | پوور، میمك، خالەت، خوشکی دایك و باوك بۆ منداڵ دەبێتە (پلك). |
| پنچك | بنە خڕنووك، حوشترالوك، پنج. |
| پڕ هەڵما | تووڕە بوون، پف هەڵما. |
| پت | پەنجە، پل، تل، (پف هەڵمابوو پتت لێ بدابوایە دەتەقی). |
| پشکی دەهێنا | غەزەبی لێ دەباری، زۆر تووڕە ببوو، شاگری لە چاو هەڵدەستاند. |
| پەلەواژ | مردار بونەوە، بە پشت دامەتن. |
| پێی بەناو نەدەهات | ساخبێری پێ نەدەکرا، پێی بەرێوە نەدەچوو. |
| پڕکێشی | پڕ دان، هەڵکوتانە سەر، ئارەزوو کردنی لێدان. |

| پیتی (ت) | |
| --- | --- |
| تارك | پەلکە هەنارو جەوت دەکولێنرێت بۆ دەبغکردنی پێستەی مەشکەو کوندەو دۆدان. |
| تازییە | بەم دوومانایە دێت : أ- پرسە.<br>ب- جۆرکێکی خامی گەورەیەو ماوەی چەند رۆژ دۆی تێدەکرێت تاکو ئاوەکەی دەچۆرێتو وەك ماست پەیت دەبێت ئەوسا لەگەڵ ساوار دەکرێتە داندۆك. |
| تانۆك | دیواری بەشورکەدار، یان دڕك، بۆ تێکردنی مێگەلە ئاژەڵ بەشەوان. |
| ترپات | دوومانا هەڵدەگرێت:<br>١-(سرپات) پاشماوەی بەکەلك نەهاتووی سماق دوای لەناو کردنیدا یاخۆ چێشت نیسك لەکاتی کوڵانیدا پەلکەکەی سەردەکەوێت بەکەوچك دەگرێت.<br>٢- پشك (قەترە) (بیرەکە ترپاتی ئاوی تێدانەماوە). |
| ترترە | ماتۆڕی سواری. |
| ترترۆك | (سۆرێنچك) بۆڕی خواردن لەو دیو قرتقرتۆکە. |
| تۆراخ | ئەم مانایانە دەگەیێنێت :<br>١- ماستی ئاولێگیراو.<br>٢- هیزە (ئەوپێستەی روونی تێدەکرا). |
| تەمۆخ | کەپکە شاخ. |
| تەپر | تۆقەرە. راستایی سەری مرۆڤ، لەتەپری سەریدالەسەر تەپری سەری دانا. |

| | |
|---|---|
| تەڕاڕ | ئەوگۆشتە ئەرمەی کەوتووەتە خوارپەرسوو.. وەك بڕبڕەی پشت . |
| تەڕاوز | دەغڵێکە لەدوای بارانی پەڵە تۆ کرابێت. |
| تەڕاوس | ئەو زەوییە کە هاوین کێڵدراوە دوای ئەوەی باران دەبارێت ئینجا ورد دەدرێتەوەو تۆ دەکرێت، ئەمدەخڵەش گیا کەم دێنێت. |
| تورت | بەم مانایانە دێت :<br>١- تفت مەیلەو ترش‌و تاڵ.<br>٢- بەم تەرزەشم ( مەمکی ئەو کچە توورت بووە) واتە تازە دێت بەردەستان بکەوێت. |
| تەربیش | بژارکردنی بێستان‌و شتی تر. |
| تەڕە داندۆك | حەرکە ساوار لەنێو (دۆ) ی تیری (تازییە) خوساوە پێیدەگوترێت (تەڕەداندۆك)، کەکرا سەلك‌و لەبەر رۆژ وشکراوە (داندۆك)ە. |
| تەیمان | چەپەر، دەرکەو دیواری لەشۆڕدارو دڕك درووست کراو بۆ راگرتنەوەی مەرو ماڵات. |
| تێومرێخ | بەنێکی کشتی باریکی (تەون)ە پاش تەواوبوونی هەرریزە (گوفك)ی مافوور، دووجار تیزو فیزی بەسەر گوفکەکان رایەڵ دەکرێت. |
| توولکێش | کەستەك و بەردی ورد لەملا لەولای تولەی بڕکە بێستان دادەنرێت، تاکو (با) لولی نەدات. |

| | |
|---|---|
| تفر | توێکلی تەنکی پێست، دەستی ئەو کچە تفری هەڵداوە. |
| تی کردنەوە | لارکردنەوە. |
| تومەز | تۆ بزانە. |
| تێلەگە | کۆڵی سەر پشتی ژنان. |
| تەنگاو | هەراسان. |
| تۆران | زیزبوون. |
| تیلاك | شەدە، تیلاك خوار شەدە خوار. |
| تار | تاری کرد یاتارو ماری کرد واتە زۆری لێدا یامار کوژی کرد. |
| تخون | نزیك (تخونی مەکەوە). |
| تاو و تۆ | گۆڕینەوە. |
| تەنکێش | تەنیشتی ولاخ- لەتەنکێشی قایم بکە. |
| تەون و بست | پیلان، موئامەرە. |
| تەڕادانێ | پێشبڕکێ، غارغارێن. |
| تاسا | واقی وڕما، موچڕکی بەلەشی داهات. |
| تیغە | ناوبڕە. |
| تەرۆك | کەلەکە، کێلەك. |
| تیتك | پرچ یا چەند داوێك لەپرچ، تینك. |
| تەڕساز | جۆرە خواردنێکە لەوتووشی دەچێت. |
| تۆك و تۆك | توانا، هێز، تۆك و لۆکی نەماوە ناتوانێ بەڕێگادا بڕوات. |
| تەنۆخ | تاوێر، بەردە مردە بەردێك لەکاتی بەکارهێنانیدا هەڵبودرێت و پارچەی وردی لێ بەربێتەوە. |

| | |
|---|---|
| تاخچە | (تاخ= تاق، دیوار + چە) چێکرن ولەدیوار دانی دارێك بۆ لەسەردانانی وردەواڵەی ماڵ. |
| تارات | پاککردنەوە لە(تهارە) ی عەرەبی هاتووە، دەست بەئاو گەیاندن. |
| تەقلە | ئاو دیوبوون، ئەومنداڵە زۆر بەئاسانی تەقلە لێدەدات. |
| تێك قژقژان | تێکەڵ بوون‌و کەس بەکەسی نەبوون. |
| تالوکە | زۆر بلێی وبەپرتەپرت. |
| تەقەلۆ | هەڵوەشان، دەستی سووتاو لە تەقەلۆهاتەدەرێ. |
| تەنی | ئەودوکەڵە رەشەی‌بەژێرەوەی سێل یابۆری سۆبەی دارەو سۆبەی قشپل و مەنجەڵەوە دەنووسێ. |
| تێمایە | سەری سوڕماوە، تێ ماوە نازانێ چ بکات. |
| تیش | ئەو بەرز زاییانەی کەلەشێوەی چاداون‌و کەوتوونەتە دامێنی چیاکان. |
| تروهات | جینگیز، بێ خێر، بێ کەڵك. |
| تەراوز | هەرتۆیەك لەدوای (١٣)ی مانگی(١٢) دوانزە بکرێ کە لە زستانە، پێی دەڵێن (تەراوز) وەیا دوای کەتنی پەرە لەزستانی تۆبکرێ وەیا لەگەڵ هاتنی حاجی لەقلەق، ئەوەش دووبەختیان دەبێت وەدەگەڕێتەوە سەر بوارە بارانیش. |
| تەبارە | دەغل و دان، گەنم جۆ پێش ئەوەی بدورێتەوە پێی دەڵێ، تەبارە. |

| | |
|---|---|
| تووخوب سنووری زەوییە | پارچە ناوەندەکی راستە لەشێوەی ریچۆکۆڵەی شەغرە وەیا حەیوان لە نێوان دووپارچە زەوی دیارکراو سنووری زەوی دیاردەکات. |
| تەپان | دوو بالینەیەبە درێژی کورتانی شەغرە، لەکۆنەگوش ولبادو پەرۆ دروست دەکرێت، لەسەر پشتی کورتانەکە دەبەسترێ لای پێشەوەی تەپانیش بۆ کەم ژانی ونەزیەتی پشتی ولاغ بەکاردێت. زۆ رجاریش وادەبێت کاکی کەشتیار دەیەوێ شەغرێک قرشەبباتەوەو تەپانی نەکردیە هەڵدەستێ بەلوولدانی پووش وپەراش وقرشە ولەسەر پشتی کورتانەکەدا دادەنێ وبن ملەکی لەسەر دادەنێ وبن زگی لێ دەبەستێ و شەغرەی لەسەر دادەنێ تادەگێنێیتە ماڵ. |
| تۆپی جەنجەڕ | بریتییە لەدووداری پتەوی لوولی خۆشکرای بەقەدەرکاریتەکی نەستوور دەبن درێژییەکەی بەگوێرەی گەورە و بچووکی جەنجەڕە نزیکەی یەك مەتر هەتا مەترێك و (٢٠) سانتیمەتر دەبێت بالتەکانی جەنجەڕی تێدا دەچەسپێندرێ. |
| تۆوبراتۆ | بەوەدەڵێن کە کەشتیارێك دوو عەلبە گەنم دەچێنێت لە کاتی دورینەوەو رەوسەهەلگرتن سەرکۆیەکەی رەوسەی دەبێتە چوار عەلبە بەوە دەڵێن (تۆوبراتۆ) مانای تۆیەکە چەندە هەندەی تری کردیە. |
| تۆقی تۆپ | بەو پارچە ئاسنەپانە دەڵێن کەدەوری سەری تۆپی داوەو نایەڵێ بشکێ وبقەلشی پانیەکەی نزیکەی دووپەنجە دەبێت بەبزمار قەیم کرایەو ژمارەشیان چوارن. |

| | |
|---|---|
| (تــــیر)ەی حوشترۆكە | لەچەشنی دار ئەقرە بەیە بەم دواییە دروست دەكرا، لەدوای حوشترۆكە بەرامبەر بەداری ئەقرەبە بەزمانە دەچووەناو حوشترۆكەكان. |
| تاپۆی عەرد | رێژەی بیستی دوو یابیستێ چوار وەردەگیرا بۆ خاوەن زەوییەكە بوو. |
| تەغار | پێوانەیەكە دەكاتە(٤٠) رِبە بۆ دەغڵ پیوان بەكاردێت. |
| تێلگە | بارێكی سووك وقەبارە گەورەیە،، لەپووش یاقسەڵ ئافرەت بەكۆڵ هەڵێ دەگرێ. |
| تارمە | كۆمەڵە خرِكراوەكەی هوردەیە لەپێش شەنە باكردن هەروەها خرِ كردنەوەی (ئاش) لەسەردیك بەبارستایەكی چاك هەرپێی دەڵێ، تارمە. |
| تەزی | سارد. |
| تەعام | خواردەمەنی. |
| تەعەجوب | سەرسورِمان. |
| تاژی | تانجی. |
| تاوەك | كەمێك، نەختێك. |
| تەلەب | داواكردن. |
| تەرەقی | دەرباز، سەركەوتن. |
| توفیق | نەجات بوون، دەربازبوون. |
| تاور | رەشماڵ. |
| توولە | سەگی بچكوكە (بۆراوكردن بەكاریان دێنا). |

| | |
|---|---|
| تەنێ | تەنیا. |
| تەڕەکار | هەرتۆیەك لەچلەی زستان بکرێ پێێ دەڵێن تەڕەکار. |
| تابیل | بەدوا داگەڕان. |
| تالان | لێستاندنی شتومەك بەزۆر داری لەخاوەنەکەی. |
| تەخشی و بەخشی | بەخشاندنەوەو دابەش کردن. |
| تاسوولقە | پارچەی شکاوی هامانە گلکارییەکانی کۆنە لەجەرەو جەلحەو کوپەرودیزەو گۆرزەو شەربە. |
| تەترەی لێو | لێـوە لـەرزە لـەکاتی گریـانو ناخۆشـی لەخۆشیشـی وادەبـێ روودەدات. |
| تەرخ | زەردو هەڵبزرکاو. |
| تەمۆخ | ئەو لاشە تاشراوەیە، کەپێکهێنەرەکانی گشتی لەلم وزیخە. |
| تاسب | مەرق. |
| تیریژ | بەوپارچە سێگۆشەیە دەڵێن کە دەکەوێتە بن هەنگڵ. |
| تام گیلێ | گێلێکی ئاشکراو دیار. |
| تاقیب | لێ پێچەوانەوە، بەشوێندا گەڕان. |
| تەخسیر | کەمتر خەمی، کەمو کوڕی. |
| تەور | قازمە. |
| تەرلان | شۆخ، شۆڕەسوار. |
| تێدەرێ | لێی وەربنالێ، بەگژی دابچێ. |
| تەبەش پان | ڕوو، ڕوومەت، دەم و چاو، بە زۆری بۆ ئافرەتی دەم وچاو پـان |

| | |
|---|---|
| تەبەش | بەکاردیٚ (تەبەش پانە دەڵیٚ ی مانگە) . |
| تەشکە مافور | مافوور، قالی، تەشکە مافوور، مافووری کوورت (٢)مەتر درێژتر نەبیٚ، تەشکە لبادیش هەیە. |
| تان | توانا، هێز، هان، (هەندیٚ تان دا بەرەخۆ). |
| تۆپە بەرماغ | بەرماغ، پەڕە دەفتەری جغارەیە، دەستە بەرماغ(٩٠-١٠٠) پەڕ دەبوو، تۆپە بەرماغ (١٢)دەستە بوو. |
| تەقەی سەری دەهات | ئاگاداری لە هیچ نییە، بە یەکێك دەگوتریٚ کە هەرچی چاکە و خراپەی بۆ بکەی ئەو ئاگادار نەبێت، کینایەیە بۆ کەسێکی گێل و بیٚ خەم. |
| تاسولقە | پارچە شکاوی هامانی گڵکارییەکانی کۆنە، پارچە جەڕە، گۆسکە، شەربە و کوپە و جەڵە و گۆزە و دیزەی ئاو. |
| تای تەورداس | تەورداس، تەور، ئەو ئامێرەیە کە بۆ دار بڕین بەکار دیٚ، هەردەم سواو و ئامادەیە. |
| تای | دەم، تیژایی، بە کەسێك دەڵێن کە هەردەم ئامادە و سواو بیٚ. |
| تەنگەی گرت | توڕە بوو، دڵتەنگ بوو، قاری پیٚ خوارد، رق هەستاو، (بە دەست ماچ کردنەکە تەنگەی گرت). |
| تاخچە | رەفە، رەفکە، تاخچکە. |
| تەڵخە | ئەو پارچە شەختەیەیە کە زستانان یاری (بزن زانی)پیٚ دەکرا. |
| تەڵخ | رەنگ زەرد، بزرکاو، ناڕێك. |
| تەقران | ساکە گۆڕ، راست، لوس، رەق (جێگای جۆخینان تەقرانە). |
| تەوێڵ | نێوچەوان تەبەش، ئەنی، هەنیە. |
| تەڕادانیٚ | قۆشمە کردن، ئەوسەر و ئەوسەر کردن، غار غارانیٚ، بە زۆری بۆ قۆشمەی ولاخ بەکار دیٚ |

| | |
|---|---|
| تخون کەوتن | نزیك کەوتن، چونە لای. |
| تەقیەی لێ بکا | لێی بترسێت، بپەنگیشتەوە (سمکۆ کەم کەس تقیەی لێ دەکات). |
| تیلەقە | بڕبڕەی پشت، گازەرەی پشت. |
| تەلان | هەوراز، رك، بەرزایی، کەندەڵان، نەورایی. |
| تەرح | جۆر، نەوع(لە مێژە شارەزاتم ئەوتەرحە پیاوەی). |
| تومەز | بە بڕوام، کورتکراوەی(ئەتو مەزانە)یە. |
| تاسان | تەزین، سەیربوون(کە هەواڵی مردنی کورەکەیان زانی هەموویان تاسان). |
| تەبەڕایە | والآیە، کراوەیە، لە تەبەروعی عەرەبی نزیکە. |
| تریقان | پێکەنی، حیلکە. |
| تخونیان بکەون | تخون/ نزیك، بەلایاندا بچن، بە کنیاندا بچن. |
| تەنکە قەلەم | قەرەم، ریش، ردێن. |
| تەقیەوە | دووبارە بوونەوەی دەنگ و باس، دەنگی دایەوە، ئاشکرابوو، پەرت بوو. |
| تیلك | پەنجە، تل (دو سێ تیلکی لە ئاگرەکە هەڵدە) کە واتە (پەنجە)، بەڵام بۆ ئاگر، دار یاخود شیشە بەکاردێ، کەچی هەر دەگوترێ تیلك، زۆرجار بۆ کاری خراپیش بەکاردێ. |
| تاسا | توانا، ئارەزوو، (تاسای نەکرد بچێتە لای). |
| تۆغیان | هەڕەت، گەنجی، عازەب، هەندێ جار یەکێکی هەبوەو خوا پێداوو دەست رۆیشتوو پێی دەگوترێ(تۆغیان)یتی. |
| تفارۆکە | تفار، منداڵ، رەنگە لە (گفل)ی عەرەبی وەرگیرابێ. |

| | |
|---|---|
| **ترِوهات** | پرِوپووچ، بیٚ مەعنا، بیٚ ناوەرِۆك، (حاجی بە زۆری قسەی ترِوهاتی کرد). |
| **تۆتکە** | نۆقرە، ئارام. |
| **تەرِۆك** | تەنکێش، لاتەنیشت، قەپرِغە. |
| **تەربیش** | بژارکردن وپاککردنەوەی بێستان. |
| **تی چاو** | تی، نیگا، گۆشە، لاچاو، گۆشەی چاو |
| **تۆپە جاجم** | جاجمی نەدوراو. |
| **تەپلی قیامەت** | تەپل، رۆژ، (هەتا تەپلی قیامەتیٚ لەگەڵی ئاشت نابمەوە). |
| **تەبسی کرد** | بیٚ دەنگی لێکردن، (بۆ ئەوەی خەمان پێوە نەخوات قسەکەی تەبس کرد). |
| **تیلەگە** | ئەو پارچە قوماشە چوار گۆشەیەیە کە ئافرەت دوو لچکی راست و چۆپ لەسەر لاشانی خۆی گریٚ دەدا، کەل و پەل و پێداویستی تێدەکات، دوو لچکەکەی دیکەی یان بەدەست دەگیریٚ یان لەناو قەد گریٚ دەدریٚ (پاشۆڵیش)ی پێدەڵێن. |
| **ترِوهات** | پووچ، بیٚ شەرم، ناکەس بەچە، پووشت. |
| **تیتلە سماقە** | یاریەکی کچانەو منداڵانەیە، لە تەمەنی(٩-١٢) ساڵی بە شێوەی بازنە بە دەوری یەکتردا دەسورِێنەوە. |
| **تەبارە** | شکارتە، زەوی تۆکراو، دەغڵی نەدووراو. |
| **توولە** | پەل، لق، قاسك. |
| **تخ** | فیروسیا، چش. |
| **تیتك** | پەرچەم، پرچ، قژ قاقۆل. |
| **تەختەی قورِ** | قورِ کێش، زەمەلە، ئەو تەختەو دارەیە بۆ قورشکێشا بەکار دیٚ، دوو دەستەی هەیەو بە دوو کەس هەڵدەگیریٚت. |

| پیتی(ج) | |
|---|---|
| جدمو | گۆوانی پشتی وڵاخو گوێدرێژبەهۆی باری گرانەوە. |
| جورغ | پینە، تایبەتە بەپینەی پیلاو. |
| جووت باقی | دوو پینەی سێگۆشەییەو بۆ قایی لەملاو لەولای لێوزاری کەوش دەدرا. |
| جەرگ و دوو (جەرگ و دونگ) | دەرگ ورد ورد دەکرێت و لەنێو دونگدا سوور دەکرێتەوە، خواردنێکی زۆر بەتامە. |
| جەلعە | وەك جەرەیە، بەلام بچووکترەو ئاوی تێدا بۆ سەر جووت دەبددرا. |
| جەوبڕ | کەسێکە مەڕ ببڕێتەوە. |
| جەو | مقەسێکی گەورەی تایبەت بە بڕینەوەی مەڕ، لەلوڕستان پیێی دەڵێن (چرە). |
| جەوەندە | کوندیەکی بچووکەو لە پێستی کارەو شوان ئاوی تێدەکردو لەبن زگی گوێدرێژی هەڵدەواسی. |
| جزیلك (چزیلك) | دونگی سوورکراوە. |
| جەوبڕانێ | مەڕ بڕینەوە. |
| جاشبڕ | پارچە دارێکە، یان (بەرمیل) چەند سەرە تیژەکەی بزماری لێجوودا بووەتەوەو لەسەر قەپۆزی (جاشك) شەك دەترێت، تاکو ئەگەر (بیبەرێت دایکی بمژێت بزمارەکان ئازاری بدەنو ئەوسا بۆی ناوسەنێت بمژێت |

| | |
|---|---|
| جاغ | جۆركێكە لەچاوپان دروست كرابێت. |
| جەلە | جۆرە هۆنینەوەیەكی قەراغەكانی جەمەدانیە. |
| جۆم | كەندی نزم. |
| جۆبرگێر | بەقوربان. |
| جارِس | مرۆڤێكە واز نەهێنێ لەجێبەجیّ كردنی كارێك؟. |
| جەرەبزە | بزێو. |
| جۆبرِكە | مەقەسە، بەعەرەبی (جەوزا)ی پێدەڵێن، جۆرە زیندەوەرێكە لەژێر زەوی دەژێت. |
| جەوی جەوی | پرچ هەرقاچین بەشێوەیەكی نارێك و لەشێوەی برینەوەی مەڕو بزن. |
| جسن | رەسەن، ئەوهەسپە رەسەنە. |
| جەرغەمە | كاری نارێكو ناپوختە. |
| جیاز | بارگەی بووك. |
| جەلحە | نیمچە جەڕەیەكی بچووكی گەرە باریكە، جووتیار نـاوی (پـیّ) دەباتە سەرجۆت بۆ خواردنەوە. |
| جەنجەڕ | بریتییە لـەوئامێرە سـادەو دەسـت كـردە كەلەچەند پەلەدارو بزمارو ئاسـن و پـردوداری لوولـە دروسـت كـراوە، بـۆ كوتـانی قرشە بەكاردێت. |
| جەنجەڕوان | بەوكەسـە دەڵـێن كـە كاروبـاری جەنجەڕەكـە رێـك دەخـات و سەرپەرشتی ودابەستانو بەردان و سواری جەنجەڕیش دەبێت. |

| | |
|---|---|
| جەنجەر دابەستان | بریتییە لەدابەستانی دوو وڵاغی جەنجەڕو بەند کردنیان بەسایەی نیرو گۆپەران وتێخستنی مژانەی جەنجەڕ وراکێشانی جەنجەڕ بەسەر پێی قرشەی جۆخین. |
| جۆخیین | ئەو شوێنە یەکاتێ بەر لەکوتانی دەغڵو دانی لێ روو دەکەن. |
| جۆگە | جۆگە بریتییە لەهێل و هەڵکەندنو قوڵ کردنی زەوی بە هێڵێکی قوڵو درێژ بۆ ئەوەی ئاو پێدا بڕوات بۆ سەر کشتوکاڵ. |
| چەو | دووئاسنی وەکویەکن، هەروەك سەریان تیژە وقونگین دەستەناویەك بەس بۆ بڕینەوەی (مەڕو بزن) بەکاردێت. |
| چاغ | کیسەیێکە لەموشەما دروست دەکرێ، توتنی تێدەکرێ، لە فەردە بچووکترە. |
| جووت | بریتییە لەدووگا جووت، یادوو نیستر یادوو گوێ درێژ کەلەژێر یەك نیلەدا بنو بەسترابن بەیەکەوە بۆ جووت کردن وکێلانی زەوی بۆکشت وکاڵ. |
| جووالْ (جوار) | جواڵ دەفرێکە بۆ هەڵگرتنی دانە بەکاردێت. |
| جەمەدانی | جەمەدانی لەبازاڕی شار هەبوو خەڵکی گوندان دەیانکڕی وەدەیان هێنا بەڵام پێش ئەوەی لەسەری کەن چوار لای رۆخی بەکەیفی ئەو پیاوەی کەچۆنی پێ جوانە ئەوها بۆیان چاك دەکردو دەچنرا بەزۆریش جەلەدەکرا ئەگەر جەمەدانی دەست نەکەوتبایە، چەفیەیان لەسەردەنا یاخود هەوریو (مشکی) جەڵەدەکران وگوڵێنگیان بۆتێ دەخرا. |

| | |
|---|---|
| جەم | کاتی نان خواردن. |
| جانەوەر | گیانداری درندە وەکو (گورگ)و(چەقەل) وکەمیتار هتد... |
| جۆگەلە | جۆگەی بچووك. |
| جەڵەو | جڵەو، شیپەلەغاو. |
| جیقنە | ریقنە، پیسی پەلەوەرو مریشك |
| جۆنی | مەبەست ( هاون، ئاون). |
| جلەی بکەین | بیهونێنینەوە. |
| جریوە | دەنگی کێشکەو سواندوکە. |
| جلەودار | جلەوکیشی، سەرقافلەچی . |
| جەندەرمە | وشەیەکی ناخۆشە، بۆ پیاوی خراپ بەکار هاتووە یاسەربازی داگیرکەر. |
| جەواڵ خرار | لە گونیەو فەردە گەورەتر بوو، جۆلا دروستی دەکرد، لە خوری و مووی بزن دەچنرا، بۆ گواستنەوەی گەنم و جۆو نیسك و نۆك بەکاردەهات . |
| جانگ شاش | جۆرە قوماشێك بوو، زۆر باش نەبوو، لە چەشنی خیوەت، منداڵ بۆی دەکرایە کراسی شۆڕ، هەر منداڵێك ئەگەر زۆر گرینکۆك و بێ دەسەلات بوایە پێیان دەگوت (جانگ شاش) . |
| جگی رەنگا و رەنگ | ئێسکێکە لە دوو لاقی دواوەی ئاژەلاندایە. هەرسێکیان بە داو وەدەخرێت دەکرانە خەناوکە و بە لانك شۆڕ دەکرانەوە لەکاتی راهەژانی لانك دەنگیان دەهات و منداڵیان پێ ژێر دەکرایەوە، هەرسێکیشیان لە کورددەواریدا پیرۆزیان هەیە. |

| | |
|---|---|
| جزیری | ئەو جۆرە خانودیە کە خشتی دیوارەکانی بە درێژی لەسەر یەك داندراون و هەردوو لا دیواری بەرینی خانووەکە بە سێ گۆشە بەرز دەکرێتەوە لە سوچی لای سەرەوە کاریتەیەك دارەڕێ دەکرێ، بەفر و باران لەم جۆرە خانووانە راناوەستن و کەم دلۆپە دەکات. |
| جرنا و فرنا | خەونی ناخۆش. |
| جرتان بکێشێ | جرت دەنگێکی ناخۆشە لە زار دەردێ بە ئانقەست، لە کوردەواریدا بە کردارێکی ناشیرن دەژمێردرێ. |
| جەعەندەم | دۆزەخ، جەهەندەم. |
| جاغ | تووردەگەی ماست، جۆرك. |
| جوعە | زیرەك، ژیر، زۆرزان . |
| جلیت | هەڵدان، هاوێشتن، یاییەکی کوردییە(مارەکەی خۆی جلیت کرد). |
| جەرپاندن | تەجرەبە، تاقیکردنەوە. |

| پیتی(چ) | |
|---|---|
| چەقێن | ئەو شوێنەیە کەزیاتر نیمچە بەرزاییەو خاکێکی چەگراوی هەیەو دەخلودان باشی نایەنێ. |
| چیرە | زۆر بڵێی وازنەینان لەقسەکردن چەنە لێدان، چیرشەوی چەند درێژە واز ناهێنی. |
| چرِدو | بزنێکە لەکاتی دۆشینیدا گوانی خۆی چرِ دەکاتەوەو شیر تەواو نادات، تاکو بۆ بێچووەکەی بمینێتەوە. |
| چرگە | گیایەکی زۆر وردەو چەشنی فریز دەچێتە پاڵ یەکدی. |
| چرگەلان | ئەو زەویە راستانەیە کە تەنیا چرگەی لێ روابێت. |
| چەرخوس | (جۆ) کە گوڵێ کردو بووە فەریك دووسێ سوارەیان لێدەدوریەوە بەئاگر دەیان برژاندو جا دەیان کوتا وردەکەی (قاویت)ی پێدەگوتراو دوخورا. درشتەکەشی (چەرخوس) ی ناوبوو بە(کەرە) و (دۆشاو) دەخورا . بەتام بوو. |
| چەرەگە | دارێکە دەدرێتە بەر رەشماڵ و لە ناوەراستی رەشماڵ دەچەقێندرێت، جاران مەرِدارانی قەراج و کەندێناوە دارەبەنیان لەچیای قەرەچوغ بۆ چەرەگە دەبری. |
| چەپەرۆك | لێدان بەرووی ناوەوەی دەستی بەناو لەپو پەنجەکان. |
| چەنگ | لەپ- چەنگە گەنم، لەپەك گەنم. |
| چاوێشە | ئەو کەسەی زۆر دەگەرِێ و چاو دەگێرِێ. |
| چما | کەواتە. |

| | |
|---|---|
| **چەکمە** | جۆرە کلاشێك بووە سەری خوری وبنی چەرم بووە، دەڵێن لە موکریانەوە دەگەیشتە دەشتی هەولێر. |
| **چاو پێ هەڵاتی نایە** | حەسوودی پێ دەبا. |
| **چاوە** | ١-ژوور، هۆدە، ٢-رۆخانەی خەرمان لەکاتی کوتان چاوەی بدەوە. |
| **چەموش** | بزێو. کەرێکی چەموشە. |
| **چەنگرە باز** | یەکێك بەچەنگان پەلاماری یەکێك بدات، پڕدان، تاودان. |
| **چەتوون** | سەخت. |
| **چاکی (چاکە)** | پێکهاتنەوەی دوو هۆز دوای شەڕ کردن، مەلودی گەردی دەڵێت بەگێتی من دەکەی چاکە لەگەمەسرەتی. |
| **چەتیم** | کچە هێتیم، بۆنزم کردنەوەی کاسەیتی کچان بەکاردێت. |
| **چاڵ** | بریتییە لەوچاڵەی کەلەزەوی هەڵی دەکەنن بەرینایەکەی لەیەك مەتر کەمتر نیەو قووڵی لەدوومەتر تاسێ مەتر دەبێت بۆ داکردنی دەغڵو دان) بەکاردێت. |
| **چاوە** | بەلای چەپی سوڕانەوەی (جەنجەر) دەڵێ، کە دەکەوێتە لای ڕەندی جۆخین بەشەندە درێتە بەرپێی جەنجەڕەکە لە کاتی و سوڕانە. |
| **چیخ** | لەقامیش دروست دەکرێ ولەدەودپشتی رەشماڵ هەڵدەبەسترێ. |
| **چارۆگە** | لەشەش گەز قوماش تەنکی ناسك بەشێوەی چوار گۆشە دەدروا شافرەت لەملی خۆیان دەکردو لەسەر شانی دەهاتە خوارێ، لەگەڵ جلو بەرگی کوردەواری لەبەر دەکرا. |

| | |
|---|---|
| **چارۆگە** | لە(٣) گەز قوماشی زۆر تەنك و جوان دەدورا لەناوەندی سێ گەزە قوماشەکەیان وەکو یەکتر لێ دەکردو هەڵیان دەبڕی لەدوای رۆخەکەیان بەباریکی دەدرووی ئینجا جوان دەنکە پولەکەیان لێ دەدرووی لەسەروکڵاوەکە لەسەریان دەکرد بەسەری خۆیان دادەدا چارۆگە لەژێر چاناگەگرێ دەدرا بە تێپەڕاندنی دوولچگی لەسەر هەدووشان. |
| **چەرمەسەرانێ** | ئەشکەنجەو تاوان لێ کردنە. |
| **چاو چرکردنە** | خۆگنجاندن، خۆ بەپاش یەخستن ودواکەوتن. |
| **چوون** | چۆن، لەبەر ئەوەی . |
| **چرا** | فانۆس، قەندیلە، لالە. |
| **چادر** | خیوەت. |
| **چش** | هیچ. |
| **چاو بڕینەچاو** | تێرامان، چاوکردنە ناوچاو. |
| **چەرمەسەر** | جوێنێکی کوردەوارییە. |
| **چاشمیش** | پەشێواو، سەر شێواو، پەرگەندە، هەرەتە بوون، سەرگەردان. |
| **چۆقە چۆق** | لێکدانی ددان، قرچەقرچی ددان، لە ئەنجامی سەرمابوونێکی زۆر یان نەخۆشی لەرز و تا، هەردوو شەویلاك وێك دەکەون و دەنگی دێ. |
| **چێشتانێکی قام** | ئەوکاتەیە دەکەوێتە نێوان بەیانی ونیوەڕۆ، لەوکاتەی کە ڕۆژگەرم دادێ. |

| | |
|---|---|
| چیدی مەڕنیسە | ڕێستن، قسە کردن، گۆ کردن. |
| چرگە | لە دوای یەکەم باران بارین گیایەکی تەمەن کورت دەردەچێ، ناگاتە دەوی بزنو مەڕ، وشك دەبێ. |
| چۆغان | گیایە وەك ئەسپون کەف دەکا، لە بەهاران کە گوڵ دەکات، گوڵکە وشك دەکرێتەوە. |
| چەقێن | دەشت و زەوی کە شوێنی راوکردنی نەبێ، هەڵەت و پەڵەت، جێگای بەرداوی. |
| چنك قژکردنەوە | بەرپەرچ دانەوە، داکۆکی لە خۆ کردن، دەست هەڵێنا، (ریقلاو خەریکی چنك قژ کردنەوەیە). |
| چوویت | خم، هەش(گیایەکە لە توخمی چەوندەرە)خمچی بەکاریان دێنا بۆ لە خم گرتنی جل و بەرگ. |
| چەپرچاخ | سیکارد، چەقۆی گەورە، تەور، تەور، شەکر شکێن. |

| پیتی(ح) | |
|---|---|
| حالۆری | بەرانو تەگە لەوەرزی مەڕ بەبەرانو بزن بەتەگـە هاتنـدا لـەنێو مێگەلی خۆیان گیرنابنو بەدوای مەڕێ بەبەرانو بزنی بەتەگە، لەمێگەلێکەوە دەچنو مێگەلێکی تر. |
| حەبرە | من زۆر حەبردی بینینی ئازادم واتە بۆ دیتنی بەپرۆشم. |
| حورمەت | ڕێزگرتن. |
| حەفت دار | شەیدا، تامەزرۆ. |
| حەژمەت | داخ، سو لەحەژمەتان نانی پێ نەخورا واتە لـەتاوان نـانی پـێ نەخورا. |
| حەلقەی ئەقرەبە | ئەو ئاسنە شیشە بیەیە کەلەچەشنی لاکێشەدایە، بـە بازنـەی مژانە بەندە بۆ ڕاکێشانی جەنجەڕ بەکاردێت. |
| جەمایەڵ | جزدان یاجانتیەیێکی بچووکە قایشێکی پێوەیە، ڕاستو چـەپ لەمل ئەکرێت. |
| حەچە | وتەیێکە بۆلی خورینی گوێدرێژ بەکاردێندرێ. |
| حەلەلە | ووتەیێکە بەکارێندرێ بۆتـێ بـەردان وهانـدانی سـەگ لەشـت وکیاندار. |
| حوشترەوان | کەسێکە هەمیشـە لەگـەڵ حوشـتردابێ، بـۆ بارەبـەری یـا بـۆ لەوەڕاندنی. |
| حۆقە | ناوە بۆ ئەندازێك لەکێش، دوو کیلۆ کگم . |
| حەرار | حەلاڵ. |
| حەیا | ئابرۆ، شەرم. |

| | |
|---|---|
| **حەسەنەوات** | کاری باش بۆ خودا. |
| **حەلانە** | بۆ شتێ کەخورمای تێی بکرێت بۆ هەڵگرتن. |
| **حاجیلە** | گیایێکی بەهارییە لاسك بەرز وەکو نێرگس، بەڵام ئەم چاوە زەردەکەی بەرزە. |
| **حاجی لەق لەق** | پەلەوەرێکی زەلامی قاچو مل درێژ دەنوك وپێ سوور خۆی سپییە سەوربالْ رەش، لە سەرەتایی بەهاردا پەیدا دەبێ لەهاویندا دەڕوات. |
| **حا** | حاحاوتەییکە بۆلی خورپینی رەشە وولاغ بەکاردێت. |
| **حەرەم گران** | بەشەرم وەحیا، گران و سەنگین. |
| **حەجمانی لێ هەلگرتیمە** | هەراسانی لێ هەڵگرتیمە. |
| **حەژمەت** | خەمو خەفەت، قین و داخ. |
| **حەکاکی** | زۆرزان- مەکرباز. |
| **حەد** | توانای زۆرداری کردن. |
| **حەفتو هەشت** | دەنگە دەنگ، چەقەچەقە. |
| **حەیفە** | مخابنە، جێگای داخە. |

| پیتی(خ) | |
|---|---|
| خەفتخان | غەمبار، خەفەتخانت کردم واتە نیگەرانت کردم. |
| خاوك | ریستراوی خۆری بۆ یەکەم جار. |
| خلتان | جۆرە گیایەکە لەرووەکی گەنم دەچێتو بەژنێك بڵند دەبێت. |
| خرێنە | لەچەشنی (بەن)ی (سیتا) یە بەلام موە بەن نییە. |
| خورجە | وەك هەگبە کەلوپەلی پێویستی ریگای تێدەکراو دەخرایە پشت (پاشکۆی)ی سوار کەچییەك (تا) بوو هەگبە دووتابوو. |
| خورمەچیچان | کولیکە میلاقە. |
| خۆشە | چەرم (پێستە)ی خۆشکراو. |
| خەسولکە | کاتی خۆی ئافرەتی لادێی (سوتەمەنی) وەك دارو قەسەڵ وپووشی لەدەشت کۆ دەکردەوەو لەسەریەکی دادەناو دەیبەستاوەو جە (گوریس) یان (کەژی)ی لەهەر چوار لاوەی شەتەك دەدا، سەری دەبردە نێوان هەردوو سەری گوریسەکەو لە ئاست گەردنی بەقولفانە لەیەکی دەبەستان. (پشتی= قەسەڵ)ە کۆکراوەکە لەپاشە لێیەوە راتاکو سەریشی رەتدەدا دادەگرت. جار بۆ ئەوەی قولفانە کەلەرێگادا نەبێتەوەو پشتییەکەی نەکەوێت چەند زلە قەسەڵێکی کەپێدە گوترا (خەسولکە) لەبەر قولفانەکە رادەکرد. چۆن (خەسوو) هەتا مردن بەرۆکی بووك بەرنادات، زلە قەسەڵەکەش تاکو دەرنەهات بووایە قولفەکە نەدەبووەوە. |
| خێڵۆك | تۆکردنەوەی دەغڵ بۆدووەم جار.ئەمشە بەم جۆرە دەبوو ( ساڵوا بووە دەغڵ لەبەر خراپی نەدوورایتەوە)، خاوەنەکەی بەدرایك، یان شتێك گوڵی دەغڵەکەی دەوەرانده نێو زەوییەکەو جاگاسنێکی لێدەدا هەرکەشین دەبوو دەگوترا ئەو دەغڵە خێلۆکە. |

| | |
|---|---|
| **خلچان** | دۆڕاندن. |
| **خاپەڕۆك** | هەرشتێکی لەمیوەجاتو وردەواڵە دوای فرۆشتنی باشەکان دەمێنێتەوە. |
| **خوسان** | نەرم بوونەوە، مانەوەی قوڕ بۆ چەند رۆژێك. |
| **خۆیی** | خزم. |
| **خیز** | تەڕایی خیزی بەگەرووی تاڵ کردووە(خیس شدن) واتای تەڕبوون دەگەیەنێت. |
| **خلیسکە** | وردە پیازی چاندنێ. |
| **خرتۆر** | تۆزو خۆڵ.سەگەکەی لەخرتۆرێ وەردا . |
| **خێو** | خاوەن، خودان. |
| **خەفتن** | بێجگە لەواتای خەوتن واتای خۆ جوانکردنو ئارایشکردن دەگەیەنێت خەملاندن. |
| **خنس** | قرچۆك، خنس بەچە= کوڕی قرچۆکی. |
| **خڕبوونەوە** | کۆبوونەوە، گردبوونەوە. |
| **ختم** | چوونە خوارەوەی دارو بزمار لەزەوی و دیوارو شتی دیکە. |
| **خدو** | خو، خدوی پێوە گرتووە. |
| **خویزە** | چەند زەلامێك بوون نان خۆرو پیاوی ئاغا بوون، هەموو تفاق و خەرجییان لەچەكو ولاٌغ وخواردن لەسەر ئاغابوو بۆ دزیو رێگری وچوونەسەر خەڵكو دوژمنانی ئاغا و ماڵ سوتاندن رادەگیران. |
| **خەناوکە-گەردانە** | ئەومێرزقەنە فلانەیە کە کچان دەیانهونەوەو لەملیان دەکەن. |

| | |
|---|---|
| خەرمان لۆغە | دابەش کردنی چەندێك لەکەنم و جۆ لەکاتی رەوسە بڕکردن بـۆ ئەو منالاّنە و هەژارانەی کەدێنە سەر رەوسەکە لەو کاتی. |
| خەوە کوتکە | بەرەو خەولێکەوتنێکی دانیشتوویە جار بەجار سەری بەرەو خوار دەبێتەوە بەناگادێت. |
| خەرمان | جوخین بریتییە لە چەند شارایەکم وشارا لەچەن مەلویك لەگەنم وە یاجۆی دووراوە شوێنی کۆمەڵ کرابیّ، دانرا بیّ بۆ کوتان وگێرە کردنو شەن و هەڵگرتن. |
| خەرت | زەوییەکە دووجار کێلدرابیّ. |
| خشتی تی | باریك، خشت لە دروستکردندا شەش پاڵویە، درێژی، پانی، بارستایی، ئەگەر لەسەر لای بارستایی دامەزرا پێیدەڵێن (لەسەر تی). |
| خەتخەتۆکیّ | دار لە زەوی وەردان، خۆ مژول کردن. |
| خومسکەی | بڕی پێنج یەك، لە بەروبوومی زەوی ئەوەندەی بۆ خاوەن زەوی دەبیّ. |
| خۆی لە گورە نەبرد | گورە، شێلو، مشەوەش، سەخڵەت، تێکدان، خۆی لە گورە نەبرد، خۆی تێك نەدا. |
| خمخانە | ئەو شوێنەیە کە خمچی کاری خمچیاتی لیّ دەکرد. |
| خوترە | بەرچیغ، داردەستی درێژ، لەگۆپاڵ گەورەتر. |
| خوچە | بچوککراوەی خوشکە. |
| خاونەبوونەوە | نەهاتنە رایێ، سارد نەبوونەوە. |
| خرِکانە | جۆرە نەخۆشییەکی پێستە، پەڵەکەی (سپی و رەش)، بە زۆری لە شوێنی دیار بەدەر دەکەویّ (دەست و دەموچاو). |
| خشی | چوون، رۆیشتن، (عەولاّ بۆ ناو منداڵەکان خشی). |
| خۆتیّ هەڵسوین | تیّ هەڵسوین، نزیك بوونەوە. |

| پیتی(د) | |
|---|---|
| دارجوتە | سەرێکی نەقیزەدارەو سەرکەی دی لەشێوەی هەوجار دوو (فلیقان= دوولق)ە خۆڵی هەوجاری پێ لێدەکرایەوە. |
| دژون | چلکن مرۆڤێك ماوەیەکی خۆی نەشوشتبێت. |
| دکر | رووبەڕوو بوونەوە بەقسەکردن وجوێن پێدان، دکرەکی پێکرد. |
| دەندە | پەراسوو. |
| دارەت | دارایی، لە دارەتی دنیایێ هیچم ناوێ. |
| دمرب | شلوق، تایبەتە بەگندۆرەی خراپو مایەوە لەبازاڕ. |
| دەو | نزیك، دەف، جەم، لەکن، دەچیتە دەو رووباری. |
| دامان | داڵغەلێدان. |
| دمۆر | خراپ، بەرد. |
| دو | دوکەڵ، دومانت، کادو، تێبینی هەمیشە لەگەڵ ئاگر دێت. ئاگرودو واتە ئاگرو دوکەڵ، دووریش نییە (دخان)ی عەرەبی لەدومان نەهاتبێت. |
| دارەت | دارایی، لەدارەتی دنیایێ هیچی نەمایە. |
| دێمی دایە | لە(دام) ی فارسیەوە بەواتای گەرم نزیکە، دوای کوڵانی لەسەرخۆ. |
| داغ | گەرم، ریشەیەکی ئاوێستایی هەیە. |
| دۆینە | جۆرە خواردنێکە. |
| داوەت | لەداواکردن هاتووە لەزمانی عەرەبی بودتە (دعوە)و (دعوە)ش لە زمانی کوردی بوودتە دەعودت. |

| | |
|---|---|
| دوغ | راست. |
| داغ دار | بەکزر، داغ لەدڵ. |
| دارسان | کەپوو بەخوێن داهاتن بەهۆی گەرماوە، خوێچڕینەوە بۆ شەڕکردن. |
| دەمچە فت | کەسێکە نەتوانێت کارەکەی جێ بەجێ بکات. |
| داغان | دابڕ، پەرتو بڵاو گورگەکە مەڕەکانی داغان کرد. |
| دەستەمستە | (دەسکەدەستەندو) دارێکی پڕ گۆڵمی کەسێکە، درێژیەکەی نزیکەی(١٤) سنم تردەبێت، لەسەردوەی (دەستەندو) بەند دەکرێ، بەسایەی تێك هەڵکێشیان لەگەڵ یەکتردا. |
| دووشاخ | دووشاخ پەرەکەی گاسن، وەیات دووگۆیەکەی دەخورێ، سەرلەنوێ دووپارچە ئاسنی بەسەر هەردووشاپەڕەکە دەتاێنەوەسەریەك بەسایەی کورەی ئاسنگەر شاخەکانی بەرین دەکرێ پێ دەڵێ، دووشاخ. |
| دووگوێی نیر | (دار خەزنە) کێروشکە دوداری تراشوی بچووکن، لەناوەندی نیر نێوانەکانیان نزیکەی لە(١٢-١٤) سم دەبێ، بۆ راگراتنی هیرتە بەکاردێت. |
| دارگراوە | چواردارى دووگۆیە، وەیاوەك سەرو قاشۆیە لەدارى بە(ڕوو) (گوێز)و(تو) دروست دەکرێ، دەخرێتە ناوچوار کونکەی (نیر) دوولای راست دوولای چەپ، ئەودار کراونە دەکەونە لای راستو چەپی ملی ولاغە دابەستروەکان، دەکیدوێتە پێش کۆپەران، لای خواردوەی دار کراوەکان بۆ بەستانی بەن کراوە. |

| | |
|---|---|
| داربەستەك | دارێکی خۆشکرایە ناوەندەکەی لولەیەو باریکە، بەقەدەر تیرۆکی نان کردن دەبێت، سەرەکانیشی باریکە، درێژیەکەی بەقەدەر بستێك دەبێت، ئەوداربەستەکە دەخرێتەناو گوریسی بەستەك بای دەدەن، تا وەکو گوریسەکە توند دەبێت سەرێکی لەشەبکەی (شەغرە) گیربێت. |
| دەلاقەی حوشترۆکە | بەینی هەردوو شونکە حوشترۆکەیە، دەلاقەیەکی تێدایەو رووەکەشی ئەخشرایە پێ دەگوترێ دەلاقەی حوشترۆکە. |
| دەفەی پاش و پێش | بریتییە لەو دووتەختە دارە بەرینە، پێش جەنجەڕ و پاش جەنجەڕ لەلێکدانی چەند پارچە شەبکە پێکهاتووە وچوارتیرەی بەبەرینی لێدرایەو هەر دەفەی چوار زمانەی هەیە، دەچێتە ناوەڕۆکی پێش و پاش حوشترۆکە، دەبێتەپارچەی توند کردنم و شاردنەوەی باڵەکانی ولابردنی چەند مەترسی رووو لەکاتی کەڕان وسورانی جەنجەڕەکە. |
| دوورەگا | سەرمژانکە لەکونی ئاخری مژانە بەلای سەرەوە دادەنێن، گاسنیش رست دەبێت، ولاغ زیاد ماندوو دەبێت لەکێلانی زەویەکە، گاسن دادەکەوێ. |
| دارجۆخین | ئەوداردیە کە لە ناوەندی (جۆخین) دەکوترێ، زەنگۆڵەی دەخرێتەسەری بۆ راگرتنی گوریسی زنجیرەی جۆخین. |
| دەست بار | دەست گرتنی دووکەس بۆ هەڵگرتنی و بارکردنی ناو خراوجوراوە، کەدەکەوێتە بەینی هەردووزەلامەکەو دەستیان بەدەوری بارەکەدا بەلای پیشەوە دەسورێتەوە بە دەستەکانی تر بنی بارەکە دەگرن و باری دەکەن. |

| | |
|---|---|
| دۆدان | پیستەی حەیوانە(مەڕ)و(گزنك)و(بەرخ) یش دەبێت، دیۆیان تێدەکرد بۆ سەپانەکان دەیان بردەسەر پەرێز، وەلە پیستە(مامز)یش دروست دەکرا، دۆی تێدا گەلی بەتام بوو. |
| داسووکە | لەشێوەی داسی گەورەیە بەلام دەم بچووك ودەسك کورترە، ژنان ودیا منالان دوورنەی پێ دەکەن. |
| دەستاڕ | دوو بەردی وەکو یەکە، بەردی بنەوە کەمێك قۆرتە بەردی سەردوەش دووکونی تێدایە، یەك دارێکی لێ قایم دەکەن، بۆ ئەوەی پێی بسوڕێن، کونی دووەمیش گەنمە کەی تێدەکەن. |
| داس | ئەوئاسنەپانە نیو بازنەییە کەباسکێکی ئاسنی خڕی شیشەیی هەیە، سەەرکی بەدارێکی تراشای لووس پڕ گۆلێك کۆتایی دێت، دەمی لای ژووری پان وکراوەتەوە تیژەوهەسانی لێ دەرێو ( دوورنەی) پێ دەکرێ، (داس) ئاسنێکی خوراکراوەیە لای سەری تیژە، لای خواردوە وەشوێنی دەستی دروست کرت. |
| داوەر | ئەوکەلە دەغلانەیەکەپێوە دەمێنێتو نادورێنەوە، لەسەپانا بەجێ دەمینێ. |
| دارڕیە | دارێکی خڕی لووسە، درێژەکەی (٤٠) سم دەبێت، بۆ دارمالێ ڕیە بەکاردێت. |
| داریە | بەپێوانی(٢٠) بیست ڕیە دەڵێن داریە( یەکداریە). |
| دەست | بریتییە لەپێوانی ئەو سەپانانەی کەبەیەکەوەبەیەك دەست دەغلە کەروو دەکەن، لەکاتی رەوسە برکردن. |
| دەستراز | لەشێوەی کەژیە، بەپانی بەبەنی رەنگاو رەنگ هونرایتەوە و چەند گورینگێکی سەرەکانیەوە هەیە، بۆ هەرلانکێك دوو(دسەترازە) بکاردێت. |

| | |
|---|---|
| دار بێرە | دووداری ڕاست وچەپە، دەدرێنەدەم یەك، شوان لە (بێرە)دا لەسەری دادەنیشت. |
| دەلینگ | لە(٢) گەز قوماشی بەسیمی (٢) گەز پۆلین دەدورا، قوماشە بەسیمکەکە بۆ خوارەوەی قوماشە پۆلینکە بۆ سەرەوەی دەدورا، دەلینگەکانی لاستیکی تێ هەڵدەکێشرا وەیان هەترس مۆر دەکرا بەدەلینگەکانی ئینجا بەسیم دەیان نەخشاند زۆر جوان بوونەوی ش لەژێرەوە ئافرەتان لە پێیان دەکرد. |
| دۆخین | دۆخین سەرەتا گوریسە، درێژایی (یەك مەتر) یا کەمێك زیاترە خوری دەریسراو دەکرا بەداوو، ئینجا ئافرەتە بەتەمەنەکان بەدەست دەیان چنی دەیان کردە دۆخین، هەردوو سەرەکانیش تۆزێك بەئارموش وسیم دەپێچرا، تا نەکرێتەوە(نەبەزی) وەبۆجوانیش بوو. |
| داندۆك | دۆوینە، خواردنەنێکی کوردەوارییە لە(دۆوبروش گەنم) دروست نەکرێت. |
| دەرقەت | پێوەستان. |
| دووریان | لێکدان وتێپەڕبوونی دوورێگایە بەسەر یەکتر هەر چاریان پێك دێنێت لەشێوەی (×) |
| دەتڕازێنی | لەبەر یەکی دەردێنێ. |
| دارمالی | کڕاو کڕ، پڕ. |
| دۆتمام | کچە مام. |
| داهێیسێ | سیس هەڵدەگەڕێ، لاواز ورەق هەڵدەگەڕێی . |

| | |
|---|---|
| دابەستی | ئەو ئاژەڵە ماڵییە کەبەتایبەتی پەروەردە دەکرێ بۆ سەربەڕین، بۆ ئەوەی قەڵەو بێ و گۆشتی زۆر بێ. |
| دیقەت | ورد بوونەوە. |
| دەشەتێنم | توندی دەکەم. |
| دەبیزێ | بێزەوەر، لەبەر چاوکەوتوو. |
| دەرێم | دەڵێم. |
| دەوار | رەشە وڵاخ. |
| دەنا | دەبێ . |
| دگۆ | دەنگی بۆق. |
| دین | شێت، سەرلێ شێواو. |
| در | دێ. |
| دیلان | شایی داوەت. |
| دوند | بەرزین شوێن. |
| داررووبە | دارێکی خڕی لووسە، درێژیەکەی (٤٠) سم دەبێت، بۆ دار ماڵی رووبەکاردێت. |
| دەبوژێن | پێش نووستنە بەچەند چرکەیەك، وەیا ئاگا لەخۆبڕانە. |
| دادۆشین | دۆشین وەدەست بەگوانی حەیواندا هێنان بەنهێم وتوندی بۆ دەرهێنانی شیر لەگووان. |
| دەست پێوەگرتن | کەم خەرجکردن، ئاگادار بوون. |
| دایە دوێ | بەردەوام بوو،بێ پسانەوە. |
| دەهری | تووڕە، زویر، خەفەتخان (زۆری لێ دەهری ببوم). |

| | |
|---|---|
| **دانذۆك** | جۆرە خواردنێکی کوردەوارییە، بەهاران لە ماست و ساوار دروست دەکرێ، دەیکەنە کفتەی بچووك لەبەر هەتاو وشك دەکرێتەوە، وەك شەوچەرە دەخورێ، زۆر کەسیش دەیکەنە شێوی دانذۆك، (ترخێنەش)ی پێدەگوترێ. |
| **دۆلاب** | ئاو لە بیر هەڵێنجان بە دەولك، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی گوریسەکە مرۆڤ رایبکێشێ، لە تەنگەی گوێدرێژێکی دەخەن ئەوکات دەبێتە کەر و دۆلاب. |
| **دەم و لەوس** | دەم و لێو. |
| **دەم لاسکە** | لەچاو کردنەوە، تەقلید، لاسایی کردنەوە. |
| **دانەومراوە** | ئۆقرەی نەگرت، ئارام نەبۆوە، دانەسەکنا. |
| **دردۆنگ** | مرو مۆچ، لالموز، روو گرژ، مۆر. |
| **دەندە** | پەراسو، تەرۆك، تەنگە، قەپرغە. |
| **دووشك** | لالووت، دوورا، بێ نێوان، لێکدی زیزبون. |
| **دۆغری** | سەر راست، راستگۆ، بێ پێچ و پەنا. |
| **دەست بڕان** | تەواو بوون، کۆتایی هاتن، (دوێنێ دەستمان لە خانوو کردن بڕا). |
| **دەستەندو** | ئەو دارە بە کلکەیە لەسەر قونکی هەوجارِ دەچەقێنرێت و جوتیار دەستی پێوە دەگرێت، لەکاتی هۆدانەوە لەسەر سەدە هەوجارەکەی پێ هەڵدەگێڕێت. |
| **دەلحاز** | یەکسەر، راستەوخۆ، (ئەخۆشەکە دەلحاز مرد). |
| **دۆبڕ** | سەرتاپان دوابڕین، بۆ فرۆشتنی مەڕ و ماڵات دێت سەر لەبەر دزی لە ماڵی خۆی براندەوە. |
| **دۆقە** | دەست لەدەست دان، دەست گوشین، پێکهاتنەوە. |
| **دکر** | دەرددان، خراپ پێ کردن، ئازاردان. |

| | |
|---|---|
| دژوون | پیس قرێژاوی، چلكن. |
| درهەم | دراوێكی كۆنە بەهای(٥٠ فلوسە) ئێستا كاری پێ ناكرێت. |
| درێشە | درێمش، زەرگ، ئەو كەرستەیەیە كە پینەدۆز بۆ كونكردنی قایش بەكاری دێنێ (كورتە دارێكی پڕ بە گوڵم، پارچە تێلێك یا سوژنێكی لەناو دەچەقێندرێ سەرەكەی تیژ دەكەن). |
| دەبنەسێت | كز دەبێت، لاواز دەبێت، دادەمێنێت، پووت دەبێنێت. |
| دەچوە گژ | گژ، لا، كن، بە زۆری بۆ توندو تیژی بە كاردێت(برۆ گژی پارەكەی لێ وەرگرە) زۆرجاریش ئەگەر كورێك لاقەی ئافرەتێك بكا دەگوترێ (چویتە گژ). |
| داس بڕ | هەر پارچە زەوییەك بۆ چەند ساڵێك بەبەردەوامی لەلایەن یەكێك تۆ بكرێ پێی دەگوترێ (داس بڕ). |
| دەغەزدار | قین، كینە، نیاز، (زۆریان لێ دەغەزدابووم). |
| داكاسێ | داكەوە، داسەكنی، بحەجمێ، ئارام بە. |
| دڕدۆنگ | مۆن، مڕومۆچ. |
| دەی تەزێنم | ئازاری دەدەم، دەی گرێێنم. |

| پیتی (ر) | |
|---|---|
| رەبەق | تەواو، بێ کەم و زیاد، یەک کاتژمێری رەبەقە چاوەڕوانت دەکەم. |
| رەدرە | کۆکردنەوەی ماڵ بۆ خاوەن مردووی هەژار کەچی لەلوڕی بەدابەشبوونی هۆزەکان بۆ تیرەو تایفەو بنەماڵەو خانەوادە دەگوترێت. |
| رەوان | لەبەرکردن، بابەتەکەی رەوان کرد . |
| رونگ | خوری. |
| راگێران | پیس بوون. |
| رەت | لادان لەرێ، بەهۆی خێرایی یا ئاگا لەخۆ نەبوون یابەهۆی نەخۆشی وبێ هێزی. |
| رەدە | یارمەتی کۆکردنەوە لەپارە، دەخل و دان.. بۆماڵی کۆچکردووە. |
| راژدی | شوقازلەی بەهێز. |
| رەدەل | سەودا، گۆڕینەوە، هەمیشە لەگەڵ وشەی بەدەل دێت رەدەل و بەدەل، هەرلە(بدل تبدیل)ی عەرەبیەوە هاتووە. |
| رەفیسك | دیوی ژوورەوەوی نێوان ران و بەلەک ودیوی دەرەوەی (چۆك-ئەژنۆ)یە. |
| رێچکە | تولەڕێ، بزنەڕێ. |
| رەوسە | بەو دەغلە دەوترێ، کە لەدوای(گێرە)و (جەنجەرش)و (شەنەبا) کردن پاك دەبێتەوە لەناو کۆتەڵ سەرکۆی دەغل و دانەکەی لەباکردنی هوردە کەو جیاواز بونەوەی لەکایەکە. |

| | |
|---|---|
| ڕەباس | پارچە زەوییەکی تۆکراو ئاودەدرێت تا ئاوەکە لەسەری دەبێت، بەگژم وەیا خەتە جۆتەکان پرش ئاو دەبن، لەسەر دەڕوا جارجارش ئەگەر باران زۆر بێت، زەویەکە ڕەباس دەبێت، ئەگەر ئاولەسەر زەوییەکە ڕابوەستێ وتێری مژیبێ. |
| ڕشتی گاسن | ئەوەیەکە (بەرکۆلە) (سەرخە) دەدرێتە بەبینی مژانەو باسکە هەوجارِ لەلای پێشەوە، دەمی گاسنەکە زیاتر ڕوو لە زەوی دەبێت بۆ ئەم مەبەستە ئەبێ ولاغەکان (دووگابن). |
| ڕۆخە | بەلای ڕاستی سورشانەوەی پێ جەنجەڕ دەلچیچن، کە دەکەوێتە لای زنجیرەکە کەلەکاتی سوڕانا دەخرێتە دەرەوە. |
| ڕەندەی جۆخین | لەدوای پێهاوێشتنەبن جەنجەڕ بەلای جۆخینەکە دەلچێن ڕەندەی جۆخین لەکاتێ قرشەو هوردە کوتینی هەریەکە. |
| ڕەوسە برشکردن | بریتییە لەبەش کردنی ڕەوسەکە (٥) پێنج بەش جۆوشەش بەش گەنم و وەکوەیەك، ئەم بەشکردنەش بۆ دیاری مافی سەپانی وتاپۆی زەوی وزەکاتی خودایە. |
| ڕەخت | خەریتەی فیشەك. |
| ڕەشبەلەك | هەلپەرکێی هاوبەش پیاوان وئافرەتانە. |
| ڕخۆك | خۆڵی مردوو بێ هێز. |
| ڕێشمە | بۆ ڕاکێشانو گرتنی ئەسپ ومایین بەکاردێت. |
| ڕەشاو | ئاوی ڕدش، ئاوێکە خواردنەوەی ببێتە هۆی مردن. |
| ڕەشکە | پێك دێت لەلێك پێچان وتووندو بەند کردنی داو مووی ریسراوی ئەستوور بەقەدەر بەن قادو لەشێوەی تۆڕشی ماسی گرتن دروست کراوە، بەلام شێوەی (شەلتە)وەك شلیفێکی گەورە وایە بۆ کاکێشان لەتارمەی جۆخین بۆ هۆردەو کادینان بەکاردێت. |

| | |
|---|---|
| ڕاپێش کردن | لێخوڕین، هاژوژتن. |
| ڕس، ڕست | بریتییە لەقایشێکی درێژ وباریك نەخرێتە(سنگ) ی تانجی لەکاتی (دیاری) کردنی کەروێشکدا، قایشەکە لە سینگ دادەماڵدرێ بۆ گیانی کەروێشك. |
| ڕنك و چۆغەڵ | ڕنك و چۆغەڵ هیچ قۆپچەی پێوەنییە، ئەویش بە قوماشی (کر) دەدورا، قوماشی(کر) بەگەزومەتر نەبوو، چونکە (کر) مووی بزنە مرەزان بوو، ئافرەتان بەتەشی دەیان ڕێست، ئینجا جولا دەیکرد بەقوماشکە پانیەکەی (یەك بستە) درێژییەکەشی (سێ مەتر) ە ئینجا پیاوان (١٥) تەختەیان دەکرد هەندێك جاریش زیاتریان دەکرد بەڕنك چۆغەڵ، هەروەکو شەرواڵ ئەویش (دۆخینی) تێ هەڵدەکێشرا، بەهاوینانو بەهاران لەبریان دەکرد. |
| ڕەند | ڕۆخی دەردەوەی قرشەی خەرمانی نەکوتراو لەکاتی جەنجەڕ کردندا. |
| ڕەند | نەترس، ئازا، مانای جوانیش دێت، ئادەمیزادی قسە خۆشو ڕوو خۆش. |
| ڕابوون | هەستان. |
| ڕاویچکە | غراغارێنێ تۆڵە تانجی. |
| ڕوان | ڕوانەوە، سوزبونەوە. |
| ڕووپەڕ | پەڕە. |
| ڕێژنە | تاوە بارانی توند کە زۆر نەخایەنێ. |

| | |
|---|---|
| رامووسان | رابواردنی دوودڵدار، ماچو موچ لەکاتی بەیەك گەیشتن دا. |
| رەوهان | خۆشرەو، رۆشتنی بەخێرایی. |
| ڕەشەراو | راوکردن بەهۆی چەك. |
| رەسەن | جسن، چاك، باش. |
| رێچکە | ریچگایەکی بچوك، رێگایەکی باریك. |
| را پێش کردن | لێخورێن، هاژوژتن. |
| ڕاو | بریتییە لە چونەدەرەو گەڕان بەشوێن نێچیرداو بۆ گرتنو گوشتنی لەهەر جۆری بێت. |
| رستن | بادانی خوری، موو، لۆکەیە، بەتەشی یابە خەرەك . |
| رسق، رزق | بریتییە لە خواردمەنی لەدانەوێلە لەماڵدا دانرابێ. |
| رۆڵە | منداڵ. |
| رەهێلە | بارانی زۆر بەخورەو وتوند. |
| رەنجبەری | ئیش کردنە بەپارە بەساڵ، یابەمانگ بۆ کەسێکی تر. |
| رەنجەرۆ | کەسێکە لەئەنجامی رەنجی خۆی بێ بەریبێ. |
| ڕەبەق | پڕ، تەواو، خشت، کڕاوکڕ ،(مانگێکی ڕەبەق نەخۆش کەوتم). |
| ربە | پێوەرێکی گەنم، جۆیە لە دەشتی هەولێر بەکار دێ (٩) کیلۆ دەکێشێ بریتییە لە شەبکە دارێکی کەوانەیی بازنەیی تەواو، بڵندیەکەی (١٤سم).تیرەکەی ناوی (٣٥سم) دەبێ. |
| رێشمە | قەراسە، سەرکەلە، ئەو پارچە زنجیرەیە کە لەسەر کەلەی وڵاخ دەخسترێت بۆ راکێشان و بەستنەوە. |
| رەوسە | سۆرە.گەنم، رەشە جۆ، جۆخینی شەن کراو. |

| | |
|---|---|
| **رەباس** | ئاودێرکراو، ئەو شوێنەی کە ئاوێکی زۆری بدرێتێ، خەتە جۆت بەبن ئاو بکەون. |
| **راویە** | ئامرازێکی ئاو کێشان بوو، لە خیوەت دروست دەکرا، چەشنی تێرکە لولەیەکی لە خوارەوە هەبوو بۆ ئاو بەتاڵ کردن (حەیزەرانێکی خێواندێ راویە ئاوێکی پێ هەڵگرت). |
| **رەپ و روو** | لەسەرچاوان کەوتن. |
| **راجفرین** | راپەڕینی لە ناکاو، خورپە کردن، لە پڕ بە خەبەر هاتن، راچڵەکین، داچڵەکین. |
| **راوکە** | ئەو هێلکەیەیە کە دادەندرێتە ژێر مریشکی هێلکەکەر بۆ ئەوەی لەسەری هێلکە بکات، دەشبێ راوکە هێلکەی پیس یان سەلکە پیازێك بێت. |
| **رابیتەی دەکرد** | رابیتە، هاتوچۆ، گەڕان لە یەك شوێن. |
| **رکابەری** | دژایەتی، دوژمن کاری، زدایەتی. |

| پیتی (ز) | |
|---|---|
| زەندۆر | قۆرتی گەورەو قوڵ لەچیا. |
| زەرگار | كلاشێك بووە لەدەشتی هەولێر لەپێ كراوە، قسەكی كۆنیش هەیە دەڵێن زەرگار لەپێیەكان رۆژەك دادێ شاری بەغداد دەگرن. |
| زرۆبی | جۆرە خواردنێكە لەهێلكەو ئاردو رۆن دروست دەكرێت. |
| زەفت (زلوبیا) | زەوت، دەست بەسەرداگرتن ئازتاد خانووەكەی زەفت كرد. |
| زەنۆگلە (بۆسە) | وێژانبەر ئەو دارە بە رووەیەكەچەماوە تەوەوتێك پەڕیوە بەسایەی هیرتە لەگەڵ نیرەكە بەند دەكرێت بۆ راكێشانی وبەند كردنی مژانە لەگەڵ نیر. |
| زبارەی هاوپەریزی | وارێك دەكەوت دووچینە دوورنە دەكرا، هەریەك بۆ كابرایەك ئەوچینەی كەلەسەرەوە دوورنەیان دەكرد، چێشتانێ یانیوەڕانێ لەدورنە دەبوونەوە، دەهاتنە سەرپەریزو تەبارەی جیرانەكەیان ئەو ماوەی لەرۆژەكەماوە دورنەیان بۆ ئەوان دەكمرد بەزبارە. |
| زنجیرە جۆخین | بەوپێی هەڵدراوانە دەڵێنكە لەكاتی قرشە شكێن هەڵدە درێتەودبەلای راستە راستی چۆخینەكە، وەك لێوارو دیوارێكی نووی بەدەوری جۆخینەكە كەپیشان دەدات. |
| زین | تاقمێكە لەدارو چەورمویێست دروست دەكرێ، دەخرێتە سەرپشتی ماینو ئەسپ بۆ ئەودی سوار لەسەری سواربێ، بۆ ئەوەی ئازار بەگیانی وولاغەكە نەگێنێ، زین لە دووشیشی ئاسنی باریكەو لای خوارەوە بەدووپارچە نەوعی داری پێوەیە. |
| زیادە | كورد زۆر جار لەژمارە(١٣) دەڵێ زیادە. |
| زاخاو | پاك كردنەوەی زێر لای زێرنگەر. |
| زەمەند | دەغڵ ودان ودیا گیاو گوڵێكی چرو ئاوگری لەپەڵ یەك، (گژوگیایی تێكچاو). |

| | |
|---|---|
| زەندۆڵ | بەو قەڵەشانەی سەر زەوی دەڵێن کەبەسایەی ناوبن کۆڵ ودادڕکراوە. |
| زوقم | شتێکە سپی ورد لەشێوەیی سایەقەو سەرمادا، لەزستاندا نەبارێ زەوی سپی دەکات وەکو وردە بەفر، جۆرێکە لە ناوونگ، (ئاوونگ) لەبەهاردا دەبارێ، زوقم لەزستاندا. |
| زرتەسوور | زەتەبور، زەبەلاح. |
| زریان | بارانی سەخت و، گێژەڵۆکەی بەفری لەگەڵ دابێ . |
| زگار | پەریشان لێ قەوماوە، وەرز بێزار. |
| زورهان | زۆرپیروکە نەفت، کەلالە. |
| زوورك | گردی بچکۆڵە بچکۆلە، چەقێنو بەرداوی بێت . |
| زەڕ | زیان. |
| زەنویز | سازگار. |
| زێد | شوێنی لەدایك بوون. |
| زد | دژ. |
| زی | دڕك. |
| زیوار بەزیوار | پارچە بەپارچە، جیجڕ بەجیجڕ. |
| زەندەقی چوو | زراوی چوو، زۆر ترسا. |
| زرۆق | بریقەدار جۆرە پێڵاوێکی کۆنی ئافرەتانە . |
| زیقۆ | بەدەمار، چیڕ، زیت، بەغیرەت، ئازا، ڕەشید . |
| زەرووری | ئاودەست، خەلا، چەشمە، ئەدەب خانە. |
| زەریف | جوان، تەواو، لێهاتوو، ڕێك. |
| زاك و ماك | گەورە و بچوك، ساوا و هەراش. |
| زناح | زینا، جووت بوون لەگەڵ ئافرەت بە ناشەرعی |

| پیتی (ژ) | |
|---|---|
| ژارك | کۆلکەی رووەکی کەنگر. |
| (ژەنگ)ی کشتوکاڵی | لەکاتی گوڵ و بۆق کردنی دەغڵ وەدان ئاسمان سۆر هەڵدەگریت دەبێتە خۆڵ باران، ئەم خۆل بارانە ژەنگ دروست دەکات، لەسەر پەلکی دەغل ودانەکە دوای ئەمەی نمە بارانێکی کەمی لی‌دەدات، بەلآمئەگەر بارانێکی باشی لێ بداتو ئاو شۆرشی بکات وتۆزەکەی لێ بێتەوە ژەنگ لە بارینی باران دیار دەدات ئەگەر ئاوی باران نیشانەی ژەنگ لە بارینی باران دیار دەدات ئەگەر ئاوی باران نیشانەی ڕەشکاوی هەبوایە لەگۆم و قۆرتەکان ئەوا ئەوساڵ ژەنگ دەبوو. |
| ژەك | بەومادەیە دەگۆترێ کەپێش لەدایك بوونی کۆرپەلە مەمکی دایك دروست دەبێ. |
| ژالە | درەختێکی هەمیشە گەلآی سەوز گۆلێکی هەیە ڕەنگی زەردە سۆر و سپی یە زۆر تاڵە (کەلو )بێکی درێژ ی هەیە دارەکەش بەزۆر دەکرێت بە(کرە) ی ئاشی چەلتۆکی پێ کرە دەکرێت. |
| ژەندن | لەقاندن، بریتییە لەراوەشاندنی مەشکە وهێنان وبردنی لەکاتێکا ماستی تێکرابێ بۆ جیاکردنەوەی کەرە لەلەماست. |
| ژنگەلی | مەبەست لەبراژانگە. |
| ژەك | بەومادەیە دەگۆترێ کەپێش لەدایك بوونی کۆرپەلە مەمکی دایك دروست دەبێ. |

| | |
|---|---|
| ژاڵە | درەختێکی هەمیشە گەڵای سەوز گوڵێکی هەیە رەنگی زەردە سوور و سپی یە زۆر تاڵە (کەلو )یێکی درێژ ی هەیە دارەکەش بەزۆر دەکرێت بە(کرە)ی ئاشی چەلتوکی پێ کرە دەکرێت. |
| ژەندن | لەقاندن، بریتییە لەراوەشاندنی مەشکە وهێنان وبردنی لەکاتێکا ماستی تێکرابێ بۆ جیاکردنەوەی کەرە لەلەماست. |
| ژن تر باب | جنێوێکە لە دەشتی هەولێر دەدرێ. |
| ژار | ژەهر، مەرگەمووش، ژاری تووڕەیی (ئەمن دەیناسم چەند بە ژارە). |
| ژاردار | ژەهراوی، ژەهردار. |

| پیتی (س) | |
|---|---|
| سەرینگان | لای سەری نووستووە. |
| سوغرە | کـار پـێ کردنـی ئاغایـە بـەجوتیاران بـەزۆری و بـێ دڵـی جووتیاران لەو کارانە. |
| سایەد | وریا، ئاگادار- سایەبە مەڕ نێتە ناو دەخلەکە. |
| سەروەشێن | لێ تێکدان، شێواندن. |
| سەرین | هـۆ، لەبـەر، لەسـەرینی جـارێ دی نـەهاتم، لەهەنـدێ ناوچـە بەبالیف. |
| سەرایی | سەرەتایی، سەرای ئاوی گەیشتە گوندی. |
| سۆتەکە | جۆرە نەخۆشیەکی (نـۆك)ە سـاڵی کـە بـوارە بـارانی زۆر بـێ، گـەڵاکانی هـەمووی دەودرێو سـوراتیەکەی دەبـات بەهۆیـەوە کرمێك لەدەنکە نۆکەکان دەداتسۆتەکە جغارەش هەیە. |
| سەردوالکە | ئەو گۆرانیەیە بەشێوەی لاواندنـەوە لەلایـەن ئافرەتانـەوە بـۆ کۆچکردوان دەوترێت، بەزاراوەی لوڕی پێی دەڵێ، گاگریو. |
| سوچ | خەتا، لە (ختا) ی عەرەبی هاتووە دوورنیە سوچ تورکی بێت. |
| سوفکردنەوە | شتێك بەیەکێك پیشان بدەیو نەیدیتێ. |
| سەرەچەنگ | ئازاردان. |
| سێبەندی | زیرەك. |
| سەروکۆك | سەرو گێلاك. |
| سەرپچڕ | بەرێوەبردنی کارێك بەناڕێکی . |
| سوغرە | کارپێکردنی بەزۆر. |
| سەرایی ها | سەرەتایی هات، بۆ هاتنی ئاو بەکاردێت. |

| | |
|---|---|
| سەردۆ | کەرە، کەدەقرچاوە دواتر دادەنراو کەفەکەی سەری کەسەردۆی پێدەگوترا، دەخوراو لایان دەبرد، بن دۆیەکەش لادەبردراونەدەخورا. |
| ساغکردنەوە | فرۆشتن. |
| سەرشۆر | گەرماو (حەمام). |
| سۆرمقان | باڵندەیەکی کێویە لەقاز دەچێت. |
| سۆدرە | تەنگو چەڵەمە، بەسۆدرەی برد واتە توشی تەنگو چەڵەمەی کرد. |
| سادانی | جۆرە سماقێکی رەنگ زەردە دەنکەکانی لەسماقی سور گەورەتروبونرخترە. |
| سەروەشێن | لێ بزرکردن. |
| ساڵدرمە | شاپ، شەق، پێن. |
| سوخەت | خەسڵەت، خووردوشت، دابونەریت. |
| سەروکڵاوفێت | سەرو کڵاوفێت ئافرەتان دروستیان دەکرد لەهەوری ڕەش سۆرگوڵینگەو ژێر چەندیان لێ دەدوری لەبن چەنگە قەیم دەکرا، لەسەر کڵاوەکەش لیرەی غازی لێ دەدورا، لاگیرەش بەلایەکی فێستەکە قەیم دەکرا. |
| سەڵتە | سەڵتە لەقوماشی یەك گەوزو نیو قەدیفە دەبڕا وبەرێ لێ دەدا، بەرکەش جێت بۆ ئەویش یەك گەزو نیو بوو وەکو یەك دەبڕا بەڵام بەقوڵ بوو، ئینجا کەدەدورا رۆخەکانی هەموودەنەخشا لەبن سەرشانەکانی هەردوو سەر قوڵەکانی بەسیمی و قەیتانی سپی زۆر جوان دەنەخشا، لەسەر کەوێکە بەوەرزی زستانان لەبریان دەکرا. |

| | |
|---|---|
| سەرمژانە | (گاینجە) پەلەدارێکی خۆش دەکرێ وەدەخرێتە ناوکونی لای سەرردوەی مژانە لەدوای تێپەڕ بوونی سەری مژانەکە، بەناو زەنگۆڵەکەدا دەبێتە رکەی بەربۆسەکە بۆ ئەوەی سەری مژانەکە نەترازێو دەرنەچێت لەکاتی رکێشان هەوجارەکە. |
| سەیناغ | راودستانی ئاوول واتە بارانێکی زۆر باریووە. |
| سەدە | (وەیاسەر سەدە) خالّی دەست پێکردنی جۆت کردنە هەتا ئەو شوێنەی لێی دەگەڕێتەوە ئەویش بەگوێرەی وڵاغ دەبێت سەر سەدەی ئیستر درێژترە لەسەر سەدەی گۆی درێژ بەقەدەرر هەندو نیوی ئەو دەبێت دەکرێ بڵێین هێڵێکی راستی کێڵانە و کگۆتایی هێلی جووت وبادانەویە. |
| سپی کێڵ | کیلدراوێك بارانی لێ دابێت سپی هەڵدەگەڕێو خۆی واپیشان دەدات. |
| سێبەرۆکە | (رەشماڵۆکە)چەند گوشێکیان لێك دەوری چوار گوریسیان لەچوار لچکە بەگوێرەی سبەینان و ئێواران رێکەوتی سێبەر سەپانەکان لەژێرسێبەرەکەی نانیان دەخواردو داسیان دەسووی پشوویان تێدا دەکردو، وەیا لەجاجم دروست دەکرا یا لە خیودت. رەشماڵۆکە عەیب بوو لەدورنەی جۆهەڵبەدەن، چونکە دەیانگوت گەرما نییە تەنها لەدورنەی گەنمو لەناوبیستان لەجۆخین هەڵدەدرا. |
| سوارە | بەو دەسکە(قامکە) دەغلە دەکات لەسەرەتاوە هەتا داکردنی کاوو دەغلو دان، گیرانیشی بەمەرجی سەپانییە. |

| | |
|---|---|
| سەربڕانە | لـەدوای ئـەوەی سـەپانەکان لەدورنـە دەبونـەوە ئاغاکـە حـەیوانێکی بـۆ سـەردەبرین وبۆیـانی دەکـردە شـیوو، وەیـا گۆشتەکەی دابەش دەکرد هەریەکیان لەگەڵ ماڵ وخێزانەکەی دەیانخوارد، سـەپان دووسـەر بـڕەی هـەبوو، یـەکیان لـەدوای کۆتایی (دورنەی جۆ) ئەوتیریش لەدوای دورنەی گەنم. |
| سەبڕانەی شوانکارە | ئەوکەسەی کە خاوەن مـەڕو مـاڵات بـوو دەهـات پەرێزەکـەی دەخوارد دەبوایە مـەرێکیش بـدات بەسـەپانەکان بـۆ سـەربڕانە بەودیان دەگوت( سەربڕانەی شوانکاری). |
| سوارە بلند کردن | عادات وابوو کەیەکێك ئەگەر بەسەردانی بهاتیایـە (سـەردورنە وتەبارە کیشـەکەر) وەیـا سـەپانەکان سـوارەکی دووراویـان بـۆ رادەگرتن وبڵندیان دەکرد ئەویش نیشانەی رێز لیچـگرتن ولـیچ هاتووی لێوەشاوەی و کەسـێتی و پیـاوەتی ئەوکەسـەی نیشـان دەدا، بۆیە لەپاداشتی ئـەم سـوارەبلند کردنـە دەبوایـە کـابرای سـوارە لێ بلند کراو شاباش وبەخشیشیان بـۆ بنێـری جاخورمـا کڕین بوایە، وەیاشیوکردن وەیاقەسپ ودۆشاو دەکرایە دیاری بۆ سـەپانەکان. |
| سیرۆکە | ئەوچوار پارچـە ئاسـنە پانەیـە دەخریچـتە بـن کلچـوکەو بـە بزمار قەیم کرایە بـۆ پاراسـتنی دارەکـەی دەوری کلچـوکەیە، کەرووبەرەکـەی چـوار گۆشـەییە لـەدەوری (١٠-١٢) سـم تـر دەبێت. |
| سەرکۆت | بریتییـە لـەوکوزرو کۆتکەیـەی کەلەسـەر سـەرەکەی بیـژینگ یاسەرەوەکەخڕەدەبێتەوە، لەکاتی بیژینگ وسـەرەند دانی دەغـل و دانەکەیە چەنگ لەسـەری هەڵدەگرن وخڕی دەکەنەوە دووبـارە دەیکوتنەوە بەبای دەدەنو دەغلەکەی لێ جیاواز دەکرێتەوە. |

| | |
|---|---|
| سەركار | بەوكەسە دەڵێ، بەئیش و كاری ئاغا دێ یەكە هەڵدەستێ و لەگشت كاروبارو مامڵەی چاندن وكێلان و سەرپەرشتی ماڵێ ئاغاش دەكات لەگشت تێكەو لێكەیەك. |
| سێپێك | سێپانە مەشكەی پێدەبەستێ بۆ هەژاندن. |
| سەڵتەزەلام | زەلامی بەتەنیا و دەست واڵابێ ئەوەی هیچی لەگەڵ خۆیدا هەڵ نەگرتبێ. |
| سەندەلوس | جۆرە دارێكە تەزبیحی لیٚ دروست دەكرێ، لەناوچەی خۆشناوەتی هەیە. |
| سبیل | لەشێوەی دارجغاری ئێستاكە بووبەڵام دەمەكەی پان وبلندسەر هەورازبوو پڕ تووتن دەكرا بۆ پلەی ئاگری دەهاوشترا سەرێ و مژی لیٚ دەدرا دووكەڵی لیٚ پەیدا دەبوو. |
| سابات | كەپرێكی گەورەیەبۆ سێبەرو دەیوەخان بەكاردێنرێ. |
| ساج (سێر) | ئاسنێكی پانی قۆقزی لوسە، دەخرێتە فیشەكدا بۆ كوشتنی كەرویشك و ریوی پەلەوەر بەكاردێ ...هتد. |
| ساچمە | قورموشێكی خڕی دوو دەلە ناوقەوانی فیشەكدا بۆ كوشتنی كەرویشك وریوی پەلەوەر بەكاردێ هتد.. |
| سوێنەر | دەفرێكە لەگڵ دروست ئەكرێ ولەباتی تەشت بەكاردێ. |
| سفرە | خوان، شتێكە نانی لەسەر بخورێت، سفرە. |
| سنگ | مێخ مێخێكە لەئاسنی یادار دروست كراوە، ئەكوترێ بەزەوی یادیواردا. |
| سەبەتە | دەفرێكە لەتۆلی بارێك دروست دەكرێ بۆ ئیش و كاری ناوماڵ وپەین رژاندن ومیوەی تیچدا ئەبردرێ بۆ فرۆشتن. |

| | |
|---|---|
| سەتڵ | دەفرێکە قوڵ قفولفدار لەمس یاتەنەکە دروست دەکرێ بۆ نیش‌و کاری ناوماڵ. |
| سەرپشك | بەو کەسە دەڵێن کەیەکەم کەسە بۆ کارێك هەڵدەبژێردێ سەرپشك دەبێ.. |
| سۆتکە | جۆرە گیایەکە لەدەشتێ شین دەبوو، بەتایبەتی جێگایەکی لماوی و دەوناو بێ، لەبنەوە جۆرە دەنکێکی رەشی پێوەیە، بۆنێکی زۆر خۆشی لێ دی، ئافرەتان بۆ بۆن خۆشکردنی خۆیان بەداوەوەی دەکەن‌و دەی هۆنەوە بۆ خەناوکەو بۆ بەنکوکەی بن لەبن هەنگری خۆیان قەیم دەکرد بە قولاَبێ. |
| سن | ئەویش لەچەشنی کیسەلەیە، بەلاَم رەنگەکەی کەمێ سپی واژوە وپنتك وهەمان زیانی هەیە، زۆر جاریش ناویان پێکەوە دەبەن دەڵێن ئەوگەنە سن‌و کیسەلەی لێ دایەو عەدمی کردیە. |
| سێ رپێ ی | کەسێکە کاسبی کردن ودەرامەتی لەهاتوو چۆدابێت. |
| سەرپەرشتی | کەسێکە چاودێری شت بکات. |
| سەین‌و بەین | تێکەولێکە، کەین و بەین‌و مامله. |
| سەردوور | دووریێی دورمانەکەی لای سەرەوەی کوتاڵەکە. |
| سەودا | گۆرینەوە لەمامله. |
| ساتمەکردن | پێ هەلترچینەوە، رووچون، هەلەنگوتن. |
| سەوداسەر | گیرۆدە. |
| سەقەت | پەککەوتە . |

| | |
|---|---|
| سەرراڵەکاندن | سەرهەژلندن، بڵند و نەوی کردن. |
| سەرجەلە | بنەڕەت، ئاجەڕەت. |
| سەرزمن | یەکەم مەڕیا بزن لەمێگەڵ دەزێ. |
| سەرسمك | سەرەپێ، لموزەپێ. |
| سوو | داخ، غەم، خەفەت. |
| سایل | سوالکەر، دەرزەکەر. |
| ساتمە | تەگەرە. |
| سەحەر | تاریك وروون بەیانی. |
| سەدەقە | بەلاگێر، قوربانی. |
| سەرین | بالیف. |
| سەهوو | لەیاد چوون لەبیر چوون. |
| سار | ساڵ. |
| سەقەر | باز. |
| سوکنا | سەبووری، هێمن. |
| سەرزەنشت | لۆمە، گلەیی. |
| سەرع | خوو، نەخۆشیەکە. |
| سینە | سینگ. |
| سەرتیز | سەرپێست. |
| سورەتمان | ئاگرکەوتنەوە. |
| سەرپەڕ | لای سەروو. |
| سەهەندە | بێ حەیا. |

| | |
|---|---|
| **سیاچاڵ** | چاڵی رەش، بەندیخانە. |
| **سارا** | دەشت، سەحرا. |
| **سك پڕ** | ئاووس. |
| **سەبەتۆکە** | زەمبیلە، سەبەتەی بچووك. |
| **سەرپووت** | کاروپیشەی نیوە چڵ. |
| **سەرپەل** | سەرلقی دارو درەخت و گیا. |
| **سەرچل** | سەرلق. |
| **سەرحەد** | سنور، حدود. |
| **سەرخان** | نهۆمی سەردوەلەخانوی دووکان. |
| **سەرخێل** | سەرکۆمار، گەورەو سەرۆکی خێل. |
| **سەرکوزمر** | پوشوو پەلای دانەوێلەی پاك کراوە. |
| **سەرلق** | سەرەپۆپەی درەخت. |
| **سەلەم** | ئەو قەردو قۆڵەیە کە خاوەن گەنم و جۆو پارەدار، بەقەردو دەیدەنە خەڵکی پێویست، بەسەلەمی سەرجۆخین، بەزۆریش سەلەم لە زستانی کەم باران و ووشکە ساڵ دەکرێ . |
| **سەرکەو بنکە** | سەروبن، بەو منداڵانە دەگوترێ کەتەمەنیان لە دە ساڵ تێپەڕی نەکردبێ (فلانە کەس شەش منداڵی سەرکەو بنکەی هەیە)، واتە گەورەکەیان هەتا گچکەکەیان . |
| **سەرگیندان** | سەرگین، پاشەرزکی گا و مانگا و گۆلکە. |
| **سەرگیندان** | ئەو پەنا دیوارە یان ئەو ئەو ژوورە بچووکەیە،کە پاشماوەی چێڵ و کا و کۆتی تێدا کۆ دەکرێتەوە پاش وشك کردنەوەی. |

| | |
|---|---|
| **سواندە** | سوانە، پەرچەمە، ئەو ردێنە زیادەیە لـە شـەقڵەو دارەرێـی خـانوو، هەر خانوێك(سواندەی)هەبوایە دیوارەکانی لە باران پاراسترابوو. |
| **سڕە** | پاشماوەی پەستراوەی ئاژەڵانـە، لـە بـەر(میـزو، تەرسـەقول و ریـخ و قشـپل)، سـاڵێ جارێـك پـاك دەکرایـەوە، لەسـەریەك دەبـوە یەك(تەلخە)ی ئەستوور. |
| **سوقیان دەبێتەوە** | سوق، مجێز، حەز، ئـارەزوو، تـەماع، دڵچـوون، سـوقیـان دەبێتـەوە، مجێزیان دەچیتێ، حەزیان دێتێ، ئارەزووی دەکەن. |
| **سەگ شێر** | جوێنێکە. |
| **سیکارد** | چەقۆی گەورە، کێرد. |
| **سفتوسۆ** | ئێش و ئازار، بە ژان. |
| **سەریان تێنا** | دەستیان پێکرد. |
| **سورتك** | زۆرەو،زۆر بڵێ، ئاڵچاغ، بێ ئابڕو،بێ حەیا. |
| **سایلی** | هەروەك، چەشنی، (منیش سایلی خەڵکی گوندی بار دەکەم). |
| **سنگورك** | دەفەی سینگ، بەرۆك، بچووککراوەی (سینگ)ە. |
| **ساموتە** | گوڵینگێکی رەنگاورەنگە لە بەن دەچەنرێت، بە زینـی ئەسـپ شـۆڕ دەکرێتەوە. |
| **سەرەدیقانێ** | سەرەتاتکێ. |
| **سەرە ناز** | جۆرە مانورێکی دەستکردی خۆمانەیەچوار مەتر درێژ دەبێت. |
| **ساکە گۆڕ** | مەیدان، دەشت. |
| **ساوازێ** | درەنگ زێ، بەو مەڕ و بزنە دەگوترێ کە کار و بەرخیان سـاوا بـێ، بەو کار و بەرخە دەگوترێ (کۆرپە). |
| **سمێڵە خچکە** | بزەی سمێڵان، زەردەخەنە، خەنین. |
| **سیڕەیان دەهات** | سیڕە مەبحە، ئابڕو:، قەردبالغی. |

| | |
|---|---|
| سەری نەهێنابەرێ | نەهاتە رایێ، رەزامەندی نەدایێ. |
| سپی کێڵ | هەر زەوییێکی کێڵدراو کە بارانی لێدابێت سپی هەڵدەگەڕێ. |
| سەرانگرێ | کـەوتن، رووچـوون (بـۆ کـەوتن لـە شـوێنی بلّنـد یـان لەسـەر ولاّغ کەوتن)ە. |
| سورکردنەوەی خەرمان | دەرهێنانی گەنی سۆر، کوتینی جۆخین و دەرچواندنی گەنم. |
| سۆیەکی | سۆ، کولك، گرێ، هەر گرتیەکی لە هەناو دەربچێت. |
| سەراو و دەراو | سەین و بەین، تێکەو لێکە، کەین و بەین. |
| لە قەوچە دانەوە | قەوچە، لموز، دەم، زار، چەنەگە، قەپۆز. |
| سەدە | خاڵی دەست پـێ کردنـی جـۆت کردنـە، هـەتا ئـەو شـوێنەی لێـی دەگەڕێتەوە. |
| سوخەت | سیفەت، عادەت، ئاکار، رەفتار. |
| سووگە | پەنا، کەندەلاّن. |
| ساڵدرمە | پێلەقە، شەق و زللە، سمرە پێ، لموزە پێ. |
| سەنگرانەوە | هەڵوەستە کردن، وەستان. |
| سیر هە نجن | ورد و خاش، کوتین. |
| سێ جرتی | هەلەکە سەما، لەخۆهەڵدان. |
| سەربار | سەرباری ڕازی بوون، لەگەڵ هەندێ، (گەنی بردو برنجیش سەربار). |
| سەرە | لە گێرەکردن، جەخجەر کردن، جۆت کردن، ئەو ولاّخەی لای دەرەوە سەرەیە ئەویدی بنەیە. |
| سەرەدەری | تێگەیشتن، فام کرد، لێزانین. |

| | |
|---|---|
| ساتمە | پێ هەڵقرچینەوە، رووچوون، هەڵەنگوتن، نووكی پێ لەشت دان، رەت بردن. |
| سایل | وەكو، هەروەكو، چەشنی، (ئەمنیش سایلی خەڵكی گوندی دەڕۆم). |
| سەرمداو | سەری قسان، سەری كێشەكان. |
| ساپ ساپانێ | ساپ/ پارچە بەردی لوس و تەنك. |
| ساپ ساپانێ | یاریەكی منداڵانەیە، بە زۆری كچان یاری دەكەن. |
| سكتری لە حەمەی كرد | سكتر، چەغە، بێ دەنگی پێ كردن، وسكتكردن، دەمداخستن. |
| سڕ گوم | بزر بوون. |
| سەركۆنە | لۆمە، گازاندە لێ كردن، سەرزەنشت. |
| سوكناتی | ئۆقرە گرتن، ئارام بوون. |
| ستی سەنە | فل قیر، بەجەهەننەم. |
| سەویەت | بە رەحم، لەسەرخۆ،هێدی، بە كاوەخۆو نەرم نواندن. |
| سایەد | چاودێر. |
| سۆدرە | قەباحەت، بە پەند. |
| سخ | كشت، توند. |

| پیتی (ش) | |
| --- | --- |
| شەقی | ماندوو، شیلاك. |
| شەوەر | شەو مانەوەی مەڕداران لەشوێنێ کەئاوی هەبێتو کۆچکردنیان لەتاریك و روون بۆ هەواری گەرمیان. |
| شنك | ١- گیایەکی ناسکو خۆشە کولیلەکەکەی زەردو لەکوریکی خەزێمە دەچێتو لەقەرچوغ دەڕوێت.<br>٢- شەوا شینك (لەناوچەی دەڕوێت) |
| شار | بێجگە لەواتای بازێر واتای چەقی یاری لەکەلایانێ دەگەیەنێت سەرەتا کەلا بۆ ئەو دەهاوێت جا کەلای کێ لەچەقەکەنزیکتر بێت، ئەو دەبێتە پاشای شار. |
| شارە | ئەولێوارەی لەدەوری بیرو چاڵ دروست دەکرێت. |
| شفت وشۆ | ئابروو. |
| شاباش | ئەو پارەیەیە کەهەڵپەرشکێکار دەیدات بەمۆزیك لێدەر، کەچی شابان بەزاراوەی لوڕی بەو مەڕە یا شتەی کەلەبڕی ژن هێنانی کەسێك بەئاغاو خان دەدرێت. |
| شەلکۆرێ | منداڵێکە دارێکی بەدەستەوەیە هەرچی لێێ نزیك ببێتەوە لێی دەدا، جا ئەم وشەیە ئاماژەیە بۆ هەر کەسێکی لێی نزیك ببێتەوە (شەلم کوێرم ناپارێزم). |
| شل وکوت | ماندوو- هەندێ لێدا تاشلو کوت بوو. |
| شەڕ | بستی، بستی نێوان دووکەلا لە یاری کەلایانێ. |
| شتاق | کامەیان. |

| | |
|---|---|
| شەپرێو | نارێك. |
| شولاق | شاپی گەورە، شا+ لاق. |
| شانەشین | سەکۆیەکە لەبەردەم گەورە مالآن دروست دەکرا. (زۆران) (ناوی گوندێکەنزیك پردێ. |
| شڕ | ١- ئاوزینگ، بەر لەمردن، سەرەمەرگ.<br>٢- کارێك هەندێ نەمابێت کۆتایی پێ بێت.<br>٣- شەپرێو نارێك. |
| شلکێنە | جۆرە نانێکە، سەرەتا روون لەسەر سێل روودەکرێت، ئینجا هەویری شل لەسەر روودەکەن. |
| شووڕك | لکەداری درێژو نەرمو شل. |
| شنك | شەواشینك، جۆرە دەوەنێکە. |
| شلکێنە | جۆرە خواردەمەنەیەکە کە لەهەویر دروست دەکرێت، کە هەویرەکە نەوەندە تەڕە بەکەوچك دەکرێتە سەرپشتی ساج لەپاش برژان دەخرێتە ناوکورەو روون دەخورێت، خواردەمەنیەکی کوردیە. |
| شەربە | گلێنەیێکی تەنکی سوورە وەکراوە لەقوڕ دروست کراوە بۆ ئاو خواردنەوە. |
| شەرواڵ | جلو بەرگێکی کوردیە پیاوان لەبەری دەکەن. |
| شەك | بەرخێ نێر یامێ ڤڤت پێ نابێتە سالّی دووهەم. |
| شەکرسێو | جۆرێکەلەسێووی شیرین. |
| شوارە بوون | بەشەوارە کەوتن، سەرلێتێکچوونی گیاندار لەشەوی تاریکدا بەهۆی بینینی چراو روشناییەوە. |

| | |
|---|---|
| شەوبۆ | گیایێکە بەتۆو ئەچێندرێ، گەڵای وەك گەڵای بییە گوڵێکی بۆن خۆی هەیە، لەشەواندا بۆن دەداتەوە. |
| شەوچرا | جۆرە چاردیەکی تایبەتییە بۆ (شەوارە) بەکاردێت. |
| شەوچەرە | خواردەمەنێکە لەشەوگاری زستاندا دابندرێت بۆ خواردن لە مێوەی ووشکەو گوێز. |
| شەودێر | کەسێکە لەشەودا ئاودرێری بکا. |
| شیر | ناوێکە سپی شیرین لەگووان ومەمك دێتەدەر. |
| شۆ | کیچلانی زەوی، پاش بارانی پەڵە. |
| شۆبرین | لەزستانان دەکرێ لەدوای پەڵەکەوتن یاباریني بارانێکی چاك لەمانگی (١-٣) نەورۆز، لەزستان هەتاحاجی لەق لەق دێت هەر شۆبرینە. |
| شەغرە | بەوئامێرە سادەیە دەڵێن کە لەچەند داری دەسکاری (تیروپەڕ) پێك هاتووە، لەچەشنی پەیژەی دارە بۆ کێشانەوەی قرشە بەکاردێت لەپەریزەوە بۆ سەر جۆخێن. |
| شەبکە شەغرە | بۆ لێك بەستنەوەی دوو پێچکە شەغرە، چەند شەبکەی یەك بەکاردێت،، بۆ شەغرەی گۆی دێر (٢) دوو بۆ ئێستروبەرزە (٣) سێ ئەویش بەقوڵ کردنی پێچکەکانی ودەرهێنانی زمانەی شەبکەکانەودو تێك هەڵکشان وبەند کردنە لەگەڵ یەکتر. |
| شاگر ئۆغلان | بریتییە لەدارێکی دوو گوێی بەقەدەر دارکراوە دەبێت، لەدوای چەسپاندنی پێچکەکانی قادەکە شەغرە لەزەوی شاگرئۆغلانەکەدەدرێتە بەرپشتە کەوانەکەی قادە لە کاتێ راست کردنەوەی شەغرە هەتاوەکو ولاغی شەغرە دێتەبەر شەغرەکەو بار دەکرێ. |

| | |
|---|---|
| شەنەباکردن | بەباکردنی هوردەی جۆخینە بۆلێك جوداکردنەوەی دان وکا. |
| شەوین | چوونی مەڕە بۆلەوەراندن لەدوای کاتژمێر(١٢) شەو، واتە لەدوای نیوەشەو تاتێر دەخوات ودەگەڕێتەوە هەوێز. |
| شەوارە | شەوخونی ونەنوستنە لەدەوری مەڵوتکە تازەبوو. |
| شەوبەکێو | لەسەرەتایی وەرزی پایزدا بەزۆری دەست پێ دەکات، شوانەکان مێگەلە مەڕدەبەن بۆ ناوچەی زوورگەکان وبناری شاخەکان ئەو شوێنەی پاوانو لەوەڕگاکانی تیایەو شەو ناگەڕێنەوە بۆ سەرهەواری خۆیان. |
| شەنە ئاسن | بریتییە لەچوارلکی ئاسن کوپەیەکی هەیە بۆ بەندکردنی دەسکێکی دارە کوکانی لەپەنجەی دەست بارکردن بۆ هەرگێروەرگێڕی قەشە وبارکردنی بەکاردێت. |
| شنەی دار | بریتییە لەچەندلکەدار نیوە چە ماوەی نوک تیژ درێژیەکانیان زیاترە لە(٣٥)سم کۆتایی لکەکانی دێت بەتێك هەلکێشان وبەندکردنی دەسکێکی دار بەسیر مەو پیستەتووندو بەندکرانە، بۆشنەبای هوردەو تێکەوڵکەی کابەکاردێت. |
| شەقلچی | بەوکەسە دەڵێن کە هەموو نێواران ڕەوسە دەرچووەکان شەقل دەکاتو جێی باوە رومتمانەی ئاغایە، شەقڵچیانش یالە ئاغای وەردەگرێ یاناغا فەرز دەکات کەبرا کەشتیارەکان چەند رووبەکی شەقڵچیانەی بدەنێ. |
| شمشێرە | بەودارە بەتینە لەتکرایە دەڵێن، کەبەناو کیسەلە هاتوو چۆدەکات. |
| شیوە خوار | لەدوای رۆژ ئابوون مێگەل دەچێتە ناوقەرسیل، وەیا پاوان نزیك دێ بۆ تێر خواردن بۆ ماوەی دووکاتژمێروە یازیاتر دەگەڕێتەوە هەوێز. |

| | |
|---|---|
| شاخ | دوو ئیسقانی ڕەش ورەق ودرێژن بەقەسەری ڕەشە وڵاغ ومەڕوبزنو ناسك وحەیوانە كێوی وگامێشەوە لەپشت گوێچکەوە دەدرێن. |
| شاخاوی | شوێنێکە وداخ وکەژو کێوی زۆر بێ وەکو کوردستان. |
| شاخی | كێوی، لەحەیوان و درەخت وگژوگیا. |
| شتڵ | بریتییە لەتۆجێگایێکی تایبەتیدا بچێنرێت لەپاش سەوزبوونی و کەمێ بەرز بوونەوەی بەریشەیەوە هەڵ ئەکەندرێت ولەجێگایێکی تردا ئامادەکرابێ وەکو (گوڵ ودێراو) ئەنێژرێ. |
| شەکرۆکە | جۆرە کەتیرەیێکە شیرین خۆش، لەدرکی گیای کەرتەشییەوە پەیدا ئەبێ زۆر سوود بەخشە بۆ هەندێ نەخۆشی و برین. |
| شاهۆ | شینە شاهۆ پەلەوەرێکی گەورەی سپی وەرشە، بەقەد لەق لەق نەبێ، بەڵام قاچ و دەنوك رەشەگۆشتی دەخورێت. |
| شاهین | باڵندەیەکی گەورەی بۆری گۆشت خۆرە لەبازگەوردترە. |
| شکارتە | پەڵە پارچە دانەویلەیێکە بۆ کەسێك چەنددرابێ. |
| شکاندنەوە | شکاندنی لقی درەخت وگەڵای توتن و گەڵاڕن کردنی توتن. |
| شێلان | دەست و پێ نانەبەپشتدا وەکو هەوێرو یاقوڕ، یایەکێك قۆرنجی هەڵستابێ دەیشێلن. |
| شێلاوگە | شێلەیێکە لەمێوە دەبێتەخوار، هەنجیرەکە شێلاوکەی لێ هەڵنیشتووە. |
| شەختە | سەهۆڵ. |
| شەق | قلیش دەرزی زەوی یانەندام. |
| شەقار شەقار | قلیش. |
| شەقاڵ | پێڵاوی کونە. |

| | |
|---|---|
| شەڤاو | هەنگاو. |
| شەونم | ئاوونگ. |
| شیرە خۆرە | شیرمژ، ساوا. |
| شیلە | دۆشاو، شیلەی شەکر. |
| شڤارتە | شخارتە، شخاتە. |
| شکار | ڕاو. |
| شکۆفە | خونچەگول. |
| شنە | کزەبا، بای فێنك. |
| شین | گریانو زاری شیوەن. |
| شیوەن | شین زاری گریان ڕۆڕۆ. |
| شیو | چەم و دۆل . |
| شلوێ | گۆڕاو لێل، ڕەنگ تێك چوو. |
| شوخاو | جوکار، خەمیە. |
| شەلال | ئەلێن فلانەکەش شەلەلی خوێن بووە، واتەلەخوێن نقوم بووە. |
| شووبرا | برای مێرد، بەنسبەت ژن برا. |
| شینگا | بازنەی شین کردن لەخۆدان. |
| شەختە | سەهۆڵ. |
| شڤارتە | شخارتە، شخاتە. |
| شیوان | کاتی ڕۆژئاوابون، مەغریب . |
| شیکە | شەکە، بەرازی مێنگەی یەکساڵە. |
| شەوکوێر | شەوکوێری، گیاندارێکە، لەشەودا کوێرە نابینی |
| شەڤاو | هەنگاو. |

| | |
|---|---|
| شەو کۆر | ئەو کەسەی بە شەو چاوەکانی باش نابینێ.. |
| شونك | پارچە دارێکی دوو بست درێژە، سەرێکی بە قەدەر بستێك خۆشدەکرێ بۆ دەست گرتن، بۆ جل شوشتن وەك کوتك بەکاردێ. |
| شنگ | توانا، تاقەت، هێز. |
| شونك | پارچە دارێکی دوو بست درێژە، سەرێکی بە قەدەر بستێك خۆشدەکرێ بۆ دەست گرتن، بۆ جل شوشتن وەك کوتك بەکاردێ. |
| شنگ | توانا، تاقەت، هێز. |
| شتاقە لنگی | شتاق، هیچ کام. |
| شەو کۆری | نەخۆشیەکە تووشی منداڵ دەبێ لە ئەنجامی خواردنی نارێك و نە خواردنی چەورایی و گۆشتی مەڕ. |
| شینە درۆ | درۆی گەورە، درۆی شاخدار. |
| شەغرەو شەغرە کێش | شەغرە کەرستەیەکی قرشە کێشانە، لە پەرێزەوە بۆ سەر جۆخین. |
| شرت و شۆی | ریسوا کردن، بەپەند بردن. |
| شۆبرین | ئەو پارچە زەوییە تۆ نەکراوەیە کە لە زستان یان سەرەتای بەهار دەکێڵدرێ بۆ کوشتنی کرم و گیای زیان بەخش. |
| شرەکە | خۆر ناوابوون، تاریك کەوتن (درەنگەو دنیا شرەکە بوە). |
| شەشاگر | دەمانچە، وەروەر. |
| شادە نوێژە | پەنجەی شەهادە، دۆشاومژە. |
| شەلفە | کەلبە، ددانی درێژ، ددانی پێشوی درندە. |
| شەبەق | گزنگی رۆژ، کازیوە، رۆژ هەڵات. |

| پیتی (ع) | |
|---|---|
| عازەب | گەنجی کچان. |
| عاسێ | سەخت، کەچی لەزمانی عـەرەبی بـەواتای یـاخیو سـەرکێش هاتووە. |
| عوزراو | ئەورایی، ئەوشوێنە نزمیەیە بـە هـۆی کۆکردنـەوەی بارانـاوو دوای وشك بوونی پڕ دەبێت لەدڕك و داڵ وەیـا بـەردەوام ئـاوی تیا کۆبۆتەوە بە هۆی نزیکی لەناوی ژێر زەوی. |
| عەمبار | بریتییە لەچاوە خانووەك گـەورەو بچـوك بەگوێچـڕەی هـەبوەو نەبووەی برای گەشـتیارە لەسـەر چـەند بـەرەی گـەورە، گـەورە بـەپان و درێـژی بنـی عەمبارەکـە ڕێـز دەکـرێ وکاریتـەی دەخرێتەسـەر بـەردەکانو هەرچـوار لای دەورەکـانی دیـواری خشتی لەسەر دەکەن وبنەکەشی بەبۆشی و بەتاڵ دەمێنێتـەوە، دەغل و دانی تێدەکەن بۆکاتی پێویست. |
| عەلبە | بریتی لەپێوانی(٣٢) ربە کەدەکا(٨) هەشت قەزناغ. |
| عەنبەربۆ | جۆرێکە لەبرنجی سەدری درێژکار، باریك زۆر بون خۆشە وبۆنی وەکوبونی (عەنبەر)ە. |
| عەیار | ئەندازێکە بۆ پێوانی دانەوێلە. |
| عەشتەبا | هیچ، کەمترین شت، قەت، ئەو وشەیە بە زۆری بۆ کەمی دانەوێڵـە و زەخیرە بەکاردێ (عـەشتەبای خوایان لە ماڵدا نییە). |
| عەجمان / حەجمان | هەراسان، ئۆقرە، نارەحەت (لـەتاوان منداڵـە سـاواکەمان حـەجمانی لێ هەڵگرتین) . |

| | |
|---|---|
| عانە | دراوێکی سەردەمی پاشایەتی بوو، بەهاکەی چوار فلس بوو، لە وڵاتی هیندوستان ئێستاش کاری پێ دەکرێ. |
| عەلەق و بەلەق | قسەی بێ سەروشوێن، بێ سەر و بەر، قسەی تڕوهات، قسەی نارێك. |
| عولعولی | تام گێل، سەر شێت. |
| عامیە | بەردەوام، بارانی بێ بڕانەوەو راوەستان. |
| عەتەبە | کۆسپە. |
| عوجب | ئەستەم (زۆری پێ عوجب بوو لە راست ئاغار سەر نەوی کا). |
| عەلبە گەنم | عەلبە، پێوەرێکە بۆ دەور کردنەوەی گەنم و جۆ بەکار دێت(هەشت)قەزناخە. |

| پیتی (ح) | |
|---|---|
| حوشترموان | کەسێکە هەمیشە لەگەڵ حوشتردابێ، بۆ بارەبەری یا بۆ لەوەڕاندنی. |
| حۆقە | ناوە بۆ ئەندازێك لەکێش، دوو کیلۆ کگم . |
| حەرار | حەڵاڵ. |
| حەیا | ئابڕۆ، شەرم. |
| حەسەنەوات | کاری باش بۆ خودا. |
| حەلانە | بۆ شتێ کەخورمای تێی بکرێت بۆ هەڵگرتن. |
| حاجیلە | گیایێکی بەهارییە لاسك بەرز وەکو نێرگس، بەڵام ئەم چاوە زەردەکەی بەرزە. |
| حاجی لەق لەق | پەلەوەرێکی زەلامی قاچو مل درێژ دەنوك و پێ سوورە خۆی سپییە سەرو باڵ رەش، لە سەرەتای بەهاراندا پەیدا دەبێ لەهاویندا دەڕوات. |
| حا | حاحاو تەپیکە بۆلّی خوڕینی رەشە وولاغ بەکاردێت. |
| حەرمە گران | بەشەرم و حەیا، گران و سەنگین. |
| حەجمانی لێ هەلگرتیمە | هەراسانی لێ هەڵگرتیمە. |
| حەژمەت | خەمو خەفەت، قین و داخ. |
| حەکاکی | زۆرزان- مەکرباز. |
| حەد | توانای زۆرداری کردن. |
| حەفتو هەشت | دەنگە دەنگ، چەقەچەقە. |

| | |
|---|---|
| **حەیفە** | خابنە، جێگای داخە. |
| **حایج** | هار، گەرم، شێت، سەر شێت، حالۆری (حایج) بۆ حوشتری نێر بەکار دێ، حالۆری بۆ نێری یان تەگە یان بەران بەکاردێ، کە لەبەر گەرمیان لە مێگەڵی خۆیان دادابڕێن و دەچنە ناو مێگەڵێکی دیکە. |
| **حریتە** | پێکەنین بە دەنگی بەرز، هارژنە. |
| **حوجەت** | بە هێز، بە قەوەت، توند، بە زەبر، تەوەژم. |
| **حولم سێ** | هەرا هەرا، چەقە و گەرەلاوژەی بێ تام. |
| **حەوجە** | پێویست (پاشاش حەوجەی گەدا دەبێت). |
| **حیلکە** | پێکەنینی بە تەوسەوە(ئەگەر میوان نەبوایە بە حیلکەیەکی گاڵتەوە وەڵامی دەداوە). |
| **حەبرەیی** | پێویستی، تەنگاوی، حەوجەیی. |

| پیتی (غ) | |
|---|---|
| غەددار | ستەمکار، زاڵم. |
| غەرگە | هەرشتێکی ئەستوور شان دا بدرابایە لەشێوەی ساقۆ پێی دەوترا غەرگە، خەرقە . |
| غلۆربوونەوە | غل بوونەوە. |
| غەزری | عینادبوو. |
| غور غورە | لەبێشکە دەخرێ بۆ ژێربوونەوەی منداڵی. |
| غەور | ژەنگ، تەم، لێلی. |
| غەنیم | دووژن. |
| غزرین | مانگرتن، بەتایبەتی مانگرتنی بەراز. |
| غەوارەیە | بێگانەیە. |
| غار | غارە، ئەشکەوت. |
| غەمر | پۆشین. |
| غەوارە | غەریب، بێگانە، بیانی. |
| غەرێفێ | ناولینگان، ناوگەڵان، (وەك سەگ کلکی لە غەریفێ ناوە). |
| غەمرێ | غومر، تراویلکە، سەراب، تۆزاوی، غێماوی، بەهاران دەشتی قمراج و کەندیناوە(غەمرێ)دەکات، بۆچوونێك هەیە کە مەخور ناوەکەی لە(غەمر)هاتوە (مەغمور)ە. |
| غەرمز | مەبەست، ئامانج، نیاز، کینە. |
| غەردارە | گیایەکی بەهاریە لە کەنگر دەچێ، بەڵام درکی نییە، بە زۆری لە قمرەچوغ دەروێ، (زۆر سوێرە) لەگەڵ ماست دەخورێ. |
| غیلاف | خیلاف، پێچەوانە. |
| غەنیمەکەتان | غەنیم، ناحەز، نەیار، دووژمن. |

| پیتی (ف) | |
|---|---|
| فەتارەت | بەفەوتانی دا واتە بەکوشتنیدا. |
| فرچك | یەکەم مژاندنی مەلۆتکەیە لەژەکی ناو مەمکی دایکی بۆ بەرخو کاریش بەکاردێت. |
| فرنجی | قاپۆتی شوانەو لەلواو بەرگ دروست دەکرێ شوان لەزستان لەبەری دەکات. |
| فرۆ | شتێکە وەکو ماست لەژکی حەیوانی تازە زا ئەمەیت، بێ هەوێنە، واتە ژەکەکە گەرم بولەپاش ساردبوونەوەیخۆی وەکو ماست توند ئەبێ وئەمەیت. |
| فریشك | ژەکێکە لەناوسکی کاروبەرخی ساوادا دەردەهێندرێ، خۆش کراوە بۆهەوێنی پەنیر. |
| فەریك | فەریکە دانەوێڵەیێکی تازە پێ گەیشتووە ڕەق نەبۆبێ فەریکە نوك یابەری دەرختێکە ڕەق نەبۆبێ وەکو فریکە قەزوان وفریکە گوێز. |
| فەرەش کردن | تەختە پۆش کردنی حەوش بەبەرد یاخشت یاکاشو تەختە پۆکردنی ناوئەستێك بەبەردو قسڵ وچیمەنتۆ. |
| فافۆن | کانێکە لەزەوی دەردەهێنرێ سپییە، زۆر سوکە زۆر شتی لی دروست دەکرێ. |
| فیکە | دەنگێکە وەك ( جوزەلە) لەدەمەوە دێتەدەر لەگەڵ (فو)دا شوان ئاژەڵی پێ لێ ئەخورێت سوار ئەسپی پێ ئاو دەداتو هێمنی دەکاتەوە، هەروەها دزیش هەڤاڵی خۆی پێ ئاگەدار دەکاتەوە. |
| فیشکە | دەنگو فیشاندنی مار. |

| | |
|---|---|
| فاق | لقی، دار. |
| فاقە | تەلە، داو. |
| فاڵ | هاتنە (تەلەب) ی ماین ودێڵەکەر. |
| فانوس | چرای دەستی. |
| فەتح | کردنەوە. |
| فەرهەنگی | فەرەنسی، بێگانە. |
| فتیلە | پلیتە |
| فروج | بارۆکەیەکە هێشتا هێلکەی نەکردبێ. |
| فرە | فراوان زۆر بێ شومار. |
| فڕە | دەنگی باڵێ پەلەوەر لەکاتی فریندا. |
| فڕین | باڵگرتن، هەلفرین. |
| فلق | زل فراوان دەڵێ. |
| فەرش | رایەخ. |
| فێرگە | قوتابخانە. |
| فس کردنەوە | خۆ کرکردن، نەوەی کێشان، قسە نەکردن. |
| فاسقی خەمسەیە | ئەو کەسەی باوەڕی بە پێنج فەرزەی ئیسلامەتی نەبێ. |
| فیتە بەدەورە | سەرانەوە، گەران بەدەوری، چەرخەلەکردن. |
| فەراقە | هەراش، مێرد منداڵ، لە خەم کەوتوو بەو منداڵانە دەگوترێ کە لەتەمەنی (١٠-٢٠) ساڵیدان. بەردەسێل . بەردەسێر بەردە ساج، لە ئاگردان سێ بەرد دادەنێین بۆ سێکوچکە ئەو ئەو بەردانە گەرم دادێن لە زستان منداڵ دەوری دەدەن، جارجارەش کاوکۆتی لەسەر دەکرێ بۆ گەشبوونەوە . |
| فل ڤیڕ | ڤیروسیا، چش، تخ. |

| پیتی (ق) | |
|---|---|
| قۆز | گەنج بۆ کوڕان. |
| قاج | لێبوردن، ئەوجارەش باقان بێت. |
| قەپێلك | توێکڵ. |
| قاپ | لاق |
| قامچی | دارێکە لاستیقێکی درێژی نەرمو شلی لێ بەستراوە بۆ ناژۆشتنی ولاّغ بەکاردێت. |
| قوش قاقەز | کزلارە. جۆرە فرۆکەیەکی منداڵانەیە لەقاقەزێك و چەند پوشکەیەك دروستنی دەکەن، وشەکەتورکیەو واتای باڵ، دەی لەقاقەز دروستکراو دەگەیەنێت. |
| قەول | پەیمان، سۆز، هەرێ، بەڵێن، لە زمانی عەرەبی بەواتای قسەگۆتن دێت. |
| قاشوغ | جۆرە قەرمێکە ئەگەر لەشفتی و گندۆر رابچێت دەیکاتە خارۆزە. |
| قەی کردوە | رشایەوە. |
| قەپاندن | ١-قۆپاندن، بردنەوە ناویەکی شت لەکانزاونایلۆن دروستکراو.<br>٢- رقاندنی شت، ئەم وایایەیان تایبەتە بەشارستانەکان. |
| قەرە پەستە | قەرەبالغ. قەرە (قەرە= رەش- تورکی) +پەستە(پەستان). |
| قوتار | رزگار، دوورخستنەوە لەستەمو ناخۆشی لەقورتاری تورکی وەرگیراوە. |
| قیچکە تەنگ | بەیەکێکدەوترێت زۆر تورەبێت. |

| | |
|---|---|
| قاتی | بڕان لە (قگع)ی عەرەبی هاتووە شەکرقاتیە. |
| قۆڕ | گونك، قسەی ناشرین و نارێك. |
| قۆنگرە | هەمووشتێکی دروستکراوی بەرز، کابرا قۆنگرەو قەراتەکی دامەزراند هەر مەپرسە. |
| قرچاوە | دەنگەناوە، دوو واتا دەگەیەنێت داغبوونی رۆن، شکانەوەی پەنجەو دارو بار، یانایەتەژوورەوە یاناچێتە سەرکار، زیاتر مندار دەغەزرن. لە (غاج) ی عەربیەوە هاتووە بەواتای تورە. |
| قوڕە پەست | ئەو قوڕە خوساوەیە کەسەری خانووی قوڕی پێ سواق دەدرێت. |
| قورقەپ | کەس نییە بۆی قسە بکات. |
| قەوچە قەوچ | قسەی بێ نرخ و بێ مانا. ئەگەر کەسێك رای لەقسەی یەکێك نەبێت. |
| قنجیلە | جۆرە گیایەکی بەهاریەو دەخورێت. |
| قەلە خەرمان | فەریکە خەرمان، دوای ئەوەی فرەیکی رەژگوڵ بەئاگر هەردەکوڕو زێندرێت. |
| قرسا | رەقبوون، تایبەتە بەدەوی مرۆڤ کە لەسەرمان یا بەهۆی نەخۆشی رەق دەبێت و ناجولێت. |
| قەپۆس | قەوچە، پۆز، بەردەم، لەقەوچەی داوە. |
| قەیاس | هێند، قەیاسەك شەکری رژاند لە (قیاس)ی عەرەبی هاتووە. |
| قەزوانی هێسکە | جۆرە قەزاوانێکە دەنکەکانی گەورەترو رەقترە لە قەزوانی بنەوشە، خەیلانی پێی دەڵێن. |

| | |
|---|---|
| قەپێلك | توێکل. |
| قونجرکە | جۆرە درکێکە نوقورچە. |
| قامچی | لاستیکێکەو دەسکەکەی دارە گوێدرێژی پێ لێدەخورِدرێ. |
| قاوەچی | بەوکابرا دەڵێن کەلەدیوەخانی ئاغا قاوەی لێدەناو ودابەش بەسەر دانیشتوانەکانی دیوەخان و مێوانەکانی دەکرد ئاغاش یارمەتی دەداو قاوەچیانەش لەکەشتیارەکانی وەردەگرت لەرووبەرك هەتا دوو رووبە. |
| قەزناغ | بریتییە لەپێوانی چوار رووبە دەغڵ. |
| قارە | ئەوسەپانەیە کە دەکەوێتە لای پەرِەگە (لای پەرێزی دوراو) لەرێزی سەپانەکان. |
| قرشە شکێنی | یەکەم پلەی کوتینی قرشەیە پێ بەپێ هەڵدەدرێتەوە لای راستی جۆخین کەپێێ دەڵێن زنجیرە جۆخین. |
| قەرانگ | لەشێوەی داسوکەیە، بەلام دەمو دەسکەکەی تەنها شیشەوخوار کراوەتەوە تیژنییە، تەنها نووکی کەمێك پام کراوەتەوە گیشکەر (تێلەکێش)بۆ خرِکردنەوەی سوارەو هەلگرتنی باوەش و دانانی گیشەو گەلاوێژ بەکاری جێنی سەپانیشبۆ لێ نانی شەغرە بەکاری دێنێ. |
| قیمەکێش | ئەوداریە کەقەساب گۆشتی لەسەر هورد دەکات. |
| قونگرەو قەرات | دروستکردنی شوێنی شەرِ وخۆپاراستنە، کۆشك وبالە خانە. |
| قورِکێل | هەرکێلانێك لەپاش باران بکرێت زەوی فەریك نەبوو بێت وکزنە بوویێتەوە، هەر قورِبێ وکێلگەکە هەمووی دەبێت بەکەستەکی رەق بەمەدەڵێن (قورِکێل). |

| | |
|---|---|
| قیناغ | وەکو ئەنگوستیلەیە سەپان وپالەکان لەکاتی دورنەدا لەپەنجەی دەکەن بەرگ یاکیفکیاپەنجەوانەی پەنجەکانە لە تەنەکە دروست دەکرێ تێلکیش بەسەر گرگرەی پشتی داهاتوو نووکێکی تیژی بەرەوخواری هەیە وپۆلیەی بەتەنەکەی پێوە دەخەن، لەکاتی دورنە(غرینگەی) لیّ دەهات. |
| قەریتە | قایشێکی بازنەییە، دەکرێتە ملی مامزو تاژی. |
| قرۆمە | زمانەی هەوجارەکە دەشکێ ولەباسکە هەوجارەو دەبێت سەر لەنوێ زمانەکە لەگەڵ قۆنکە هەوجارەکە بەند دەکرێتە وەبەسایەی چەند کونێك دەکەن لەزمانەکەو قونکە هەوجارەکە، چەند پارچە تشتی لەناو رادەکەن وسەرەکانیان دەقاچێتەوەویا بەو دواییە بە(بورغی) قەیم دەکرا. |
| قۆپەن | بەو کۆمەڵ گەنم و جۆیە چڕەی پاڵ یەك دەڵێن، کەشین بوونە بەتایبەتی لەدەوری شارە میروستانەکان دەبێت. چونکە دەغلیان دزیوەو بارانی لیّ داوەوشین بوە، یالەشوێنی رژانی دەغلەکە لەکاتی تۆدان. |
| قەرە خەرمان | چەند دەسکێکە لەگەنمی رەشگۆڵی تەڕێ شیرتێپەڕیو دەنێن و ئاگرێك دەکەنەوە ئەم دەسکانە دەخەنە سەرئاگرەکە هەتا هەندێك خاوە برژێت وبرژنکەکانی لی دەسوتێن و لەدوایدا دەکوترێ و گەنمەکەی یانەوەها دەخۆن ویا دەیکەن بەشێوەی قەرەخەرمان هەموو جۆرە شتێکی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن بەگوێری عاداتی هەرشوێنێك جیاوازیان هەیە. |
| قەف | گرێ و لەلەێکە لەقامیش و دار حەیزەران و هەندێ گیادا . |
| قەفەز | قەفەز، شوێنێکە پەلەوری تێدا بەند ئەکرێت وتێدا رادەگیرێت. |

| | |
|---|---|
| قەلانگ | دارێکە درێژ گوێزی پێ ئەتەکێنن، واتە گوێزی پێ ئەخەنە خوار لەچڵەو پۆپەکی دار گوێزەوە. |
| قەمچی | شەلاخ، قایشێکی هۆنراوە بەسوار بۆلێ خورپینی چارەوی بەکاری دێنن. |
| قەمە | قامە تیخێکە وەکو شمشێر بەڵام دەم راستەوکەوانەی نییە قولابێکە قەساب گۆشتی پێدا هەڵ ئەواسێت. |
| قەوزە | بەڵخێکی سەوزە وەکو(سیپاڵ) ئەکەوێتە سەرئاوی مەند. |
| قەیسەری | چەند دوکانێکە لەیەك شوێندا بەقاپێ یازیاتر رێگای ئامۆشۆی ئەبێ بەسەرداو سەری هەموو دوکانەکان گیرابن. |
| قۆچکە | کلاوێکە ئەوکرێتەسەر منداڵێ ساوا. |
| قۆری | دەفرێکە چای تێدا دەکورێت. |
| قیلم قاسێ | لەکاتی منداڵ لەسە رمل داناتنا لنگێکی بەلای راست ویەکێ بەلا چەپ بەپێش سینەی دێتە خوارەوە بەهەردوو دەستەکانی خۆی دەستی منداڵە هەلگیراوەکە دەکرێت. |
| قامکەبن | هەڵ کردنی گلۆلەی بەنە بەڕاست وچەپ لەسەرباری درێژی. |
| قەزمە | سەروکلاو (کلاوزی قرۆش باوی) پێشان ئافرەتان دەبو قەزمە لەسەر دابنێن، ئەویش بریتییە بوو لەکلاوێکی ئەخشدار لەگەڵ هێزاری رەش وسپی یان هەوری سۆر دەپێچرا بەقولابێ لەدەوری کلاوەکە قایم دەکرا لە هەردووسەری هەورییە کە کلکەکانی دێتەخوارەوە لەپشتەوە گولێنێکی لێ دەدرا گولێنگەکە لەئارمووش رەشی بوو بەسیمی سپی دەپێچرایەوە لەپشتەوە شۆر دەبۆوەو پێیان دەگوت (لفکە). |
| قامکەبەن | هەڵ کردنی گلۆلەی بەنە بەڕاست و چەپ لەسەرباری درێژی. |

| | |
|---|---|
| قاوەخانە | چاپخانە جێگای چای و قاوەلێنان. |
| قەپۆز | لمۆز، ئەو ئەندازەیە لەسەر کەلەمی ولاغدا لەکاتێ ئاو خواردن دانەچێتەوە ناو ئاوو تەردەبێ. |
| قەسەرێ | کۆکردنەوەی دوا دوورنە، بۆ مەبەستی سوتانو خواردنی مەڕومەلات. |
| قادە | بەم دارە خوارو چەماوە دەڵێ، لەشێوەی بازنەی دەم کراودیە دوو پەلەکەی راستو درێژ کراوەتەوە راستە پشتی قرشەکە دەگرێت ئایەلی شەغرەکە برژێتو پەرت بێت لەداری گوێز وەیا بەروو دروست دەکرێت. |
| قون ئاگردان | قوانچکی جێی کاودار وبەردەستێردو ئاگردانە. |
| قۆناغ | شوێنی راگرتنو حەسانەودو پشودانە. |
| قەسپۆك | خاکێکی رەقی هەڵوەشاوە. |
| قوتکە قوتك | سەردەرهێنان و بەرزبوونەوە بۆ سەیرکردن. |
| قەبوور | پێ رازی بوون، وەرگرتنەوە. |
| قشتیلە | جوان. |
| قەف | گرێ ولەلەێکە لەقامیش و دار حەیزەرانو هەندێ گیادا. |
| قەنە | سبیل، قلیان. |
| قەن | قەند، شەکر. |
| قرچە | کاتی گەرمای نیوەڕۆ. |
| قژ | پرۆپ لقی وردی درەخت، یامووی سەر. |
| قۆچ | شاخی حەیوانو سەر وەشاندنی حەیوان لەشتی تر . |
| قۆچ | قوربانی. |
| قۆچەکانی | بەردەکانی، قەلماسك. |

| | |
|---|---|
| قۆرغ | قەدەغەکردنی زەوی لەبڕینی دارو درەخت و گیا. |
| قۆرە | بۆرەی مانگاو گاجووت. |
| قۆڕ | گون زل، وەتەبا. |
| قۆڕگ | گەرو، قورقوراگە. |
| قول | قاچ، پێ. |
| قۆڵ | باڵ دەست. |
| قیت | قنج راست. |
| قون ئاگردان | قولنچکی جێی کاودارو بەردەسێرو ئاگردانە. |
| قرساندن | گیرکردن، توندکردن. |
| قورقەپ | لێوخستنە سەریەكو قسە نەکردنە. |
| قەرە بەقەرە | شان بەشانو دوور نێزێک. |
| قەد | بەژنو باڵا بۆگیان دارو درەخت. |
| قازانج | سود، کار، دەرئاماد. |
| قەتارە | ریز بەستنی قازو قۆلینگ وشتی تر. |
| قافلە | کاروان. |
| قەتارچی | کاروانچی. |
| قالب | شتێکە خشتی پێ ئەبردێ، یا پێلاوی لەسەر ئەدورێت، یاوەکو قالبە سابوونە. |
| قالی | فەرش، مافور. |
| قامك | پەنجە، ئەنگوست، کلك. |
| قەبرەغە | قەورەغە، لاپەراسو، کەلەکە. |
| قەپ | گاز. |
| قەپان | کێش، تەرازوو. |

| | |
|---|---|
| قرساندن | گیرکردن، توندگرتن. |
| قەبە | گەورە. |
| قۆرقەپ | لێوەخستنە سەریەك وكركات نەكردنە. |
| قشپل | پیسایی مەڕوبزن. |
| قەلۆغان | گولێکی دڕکاویە، تاساوابی دەخورێ . |
| قەوی | زۆر، توند. |
| قوم | فرڕلی دان. |
| قەرات | قەلات. |
| قومارباز | فێلباز. |
| قەد | هیچ. |
| قەیماغ | توێژی شیری کولاوە |
| قەهر | خەفەت، خەم، قەهر، دلتەنگی، (لە قاران گینگلەی دەخواردەوە). |
| قۆشمە | غارغارێن بە ولاخ، هەلاتن بە ولاخ، کێ برکێ. |
| قورە پەست | بەو دیوارە دەلێن کە بە تەنیا بە قوڕ دروستکراوە و بەبێ بەکارهێنانی خشت و بەرد. |
| قیت | بلند، راست، هەستانەوە (لە جێگاکەت قیت بەوە). |
| قرت وفرت | دلەڕاوکێ، نیگەران. |
| قەوچە | قەپۆز، دەو، لموز. |
| قەرەپەستانێ | شوێنی بەرتەگ، بە زەحمەت چوونە پەنایەك، بە زۆر ئاخنینە ناو، پالەپەستۆ. |
| قوتە پۆش | جۆرە بزنێکی کوردییە، نێو چاوانی داخە مەیەکی سپی تێدایە. |

| | |
|---|---|
| قۆپتاس | گولێنگێکی لە زیو دروستکراوی ئافرەتانەیە، لە هەردوو لچکی هەوری سرکەیی دەبەسترێت. |
| قان | پارچە، بڕ، (ریقلاو پێی لە قانە تۆلکەیەك گیر بوو). |
| قەوام | توان، شنگ، هێز، (دیوارەکە بەرزە لە قەوامی نییە سەرکەوێ). |
| قیچێك | کەمێك، نەختێك، تۆزێك، بڕێك، هەندێك، پیچێك. |
| قرشە | ئەو گەنم و جۆیە دوراوەیە کە کراوە بە جۆخین، ئامادەیە بۆ کوتان. |
| قاشۆ | داری سەر چەماو بۆ گۆبازی (قاشوانێ)یاریەکی کۆنی کوردەواریە، ئێستا لە جیهان (گولفی)پێ دەگوترێ. |
| قەمتەرە | ئەیوانی دەرگای حەوشە. |
| قۆڕ | نارێکن خراپ، پووچ، چرووك، (تخونی ئەو ئیشە قۆڕانە مەکەوە). |
| قوتار | دەرباز، نەجات، دەرچوون. |
| قەنداری | قەندەهاری، جۆرە گەنمێکە. |
| قەلاشکەری | داری وشك کراوە، دار بەڕووی بە بیور شکاو، داری قەلێشراو. |
| قنچکە تەنگ | بێ سەلیقە، بێ حەوسەلە، بێن تەنگ. |
| قولەمس | جۆرە بزبێکە چاوەکانی سورن و گوێچکەکانی پان و درێژن لە زەوی دەخشێن. |
| قەلەزراو | ترسنۆك، بێ زات، بێ زاخ، زەندەق چوو. |
| قرمسا | ردق بوو، ردق بوو، (لە سەرمان دەوی قرمساوە). |

| | |
|---|---|
| قرساندن | گیرکردن، توند کردن. |
| قافی بێ | کاتی بێ، وەختی بێ. |
| قەزناغە | پێوەرێکە دەکاتە چوار(ربە) یان (٣٦)کیلۆگرام. |
| قونجرگان | درِك، سێ سۆ، گیایەکی دڕکاوی بە زەوی وەدەنوسێ. |
| قلپ | قلپێنە، قرقێنە. |
| قامکە | چەپکێك، دەسکێك، قەفتەك. |
| قون بادان | مادەللایی، چەندوچۆن کردن، ئەم لاو ئەولاکردن. |
| قەپرغە | تەنگە، بن هەنگڵ، تەرۆك. |
| قەلاقوچکە | تەقلەلێدان. |
| قولاخ | وشت، بەهەست. |
| قەبز بوو | تووڕە بوو، سل بوو، تێکچوو. |
| قەوغە | قەڵە بالَخ، گوندی گەورە. |
| قەرمور | سەرەتا، پێشەکی. |
| قەپێلك | قاوغ، پێست. |
| قرِوقەپۆز | دەم و لێو، لموز |
| قالی | جۆرە مافورێکی کوردییە، بەڵام درێژ نییە. |
| قەیناغ | ئەو کیفك و چەنجە کێشانەیە کە سەپان لە پەنجەیان دەکردلە دروێنە کرد. |
| قەسپۆك | ئەو خاکەیە کە خۆڵەکەی چەشنی وردە بەردە، ناکرێتە قوڕو یەکدی ناگرێ. |
| قاندر | دوژمن، غەنیم، مەراق، تاسب، (زاڵمەی بوویتە قاندرِی کورِەکەمان). |

| پیتی (ك) | |
|---|---|
| کۆر (کول) | ١- رك. لۆحەندە بەکۆر کاردەکەن.<br>٢- کول زۆر بەکول دەگرییێت . یان بەمانای چەقۆیەکە زۆر کۆربووە. |
| کفت | ماندوو، وەستیای، هیلاك. |
| کسکە | دوای کولاندنو تاواندنەوەی دونگی مەڕ دروست دەبێت بەلووری پێی دەلێن قورمە. |
| کەرپ | ددان. |
| کێشتان | دوای هەلاتنی رۆژو بان. |
| کەسەر | خەم، ئەندوو. |
| کۆرك | کۆخە رەشە. |
| کەچە | کۆن، بێ کەلك لەکار کەوتووە. |
| کۆچك | دیوەخان، پێشقك، لەزاروەی لوڕی پێی دەلێن سورستان. |
| کەپەك | سقی ئەوپەلکە تەنکەی گەنە لە کولاندنو هارینی جیا دەبێتەوە، بەزاراوەی لوڕی پێی دەلێ، سۆسی. |
| کەینو بەین | راز. |
| کەلا | مات، کەلایانێ ماتانێ، یارییەکی مندالانە. |
| کەپکە | خۆلولدانی مار بۆ خەوتنو پشوودان. |
| کەمۆ | جاقی، زۆرزان. |
| کڕ | ١- بێ دەنگ، هێمن . ٢-کورك بوونی مریشكو هەلنیشتنی لەسەر هێلکەکانی. |

| | |
|---|---|
| کەچ | خوار، مل کەچ، تەوین. |
| کەڕسیسە | قەردبالغ. |
| کۆتان | جەمە خواردنێکی مێگەلە مەڕە لە پاوان، بەگشتی مێگەلە مەڕ هەر رۆژەی لەبەشێکی پاوان دەلەوەڕێننکە پێی دەلێن دانگە، بۆ رۆژی دواترش دەبیەنە شوێنی دیکە لەهەمان پاوان واتە دانگەیەکی دیکەی دەوێ. |
| کۆندڕ | کەندڕ، ئەو قولتەی ئاو دڕیتی لە کەندان. |
| کاش | هەموو. |
| کز | بێ زەوق، بێ گیول، نزم، بێهێز. |
| کرۆر | جۆرە کاردیەکە لەسەر بەردان دەڕوێت. |
| کەلەك | تەرۆك، تەنکێش. |
| کوریکە | کوریکی بڕکە گوندۆرە. |
| کەل‌و کرۆم | پارچە پارچە، دەمو ددانی کەل‌و کرۆم کرد. |
| کەرزڕی | بەخورتی، بەتۆبزی. |
| کوزر | بریتییە لەو نیوە گوڵە پاچاریەکە لەوگوڵانەی کەبەبەر پەڕێ جەنجەر نەکەوتوون و نەکوتراون، بەکوتك یابە گێرە دەیکوتن ودەغلەکەی لەناودا دەردێت. |
| کفر وگەز | دوو جۆرەدارن ئاوەکەیان بۆنخۆش بۆوشکە بیرۆ بەکاردێ. |
| کارەکەر | لەسەردەمی کۆن وئێستاش لەزۆر شوێن‌و لەزۆر ماڵ بەتایبەتی لەماڵی ئاغاکان‌و لەماڵێ سەرۆك خێلەکان یەکێکیان ئەکردە (کارەکەر)چ پیاو یاخود ئافرەت بۆ خزمەتکردنی خۆیان ماڵ‌و منداڵەکانیان. |

| | |
|---|---|
| کۆپەران | پارچە قایشێکی خوار کراوەیە بۆ ملی وڵاغبەکاردێ، کۆپەران ناو قایشەکە زۆر جاران (خوری) یاخود پیستە) ئەخەنە ناوی بۆ ئەوەی ئازار بەگیانی وڵاغە کەنەگێنێ کۆپەران لەکاتی رۆیشتنی وڵاغو عەرەبانە بەکاردێ لەلوول کردنی گوێش و کۆنەپەرۆو کۆنەلباد دروست دەکرێت، دەوری بەقایش دەگرن. |
| کەندوو | پێشان کەندوو هەبوو، سەرەتا خۆرەکەیان ئەکردە قوڕماوەیەك لێکیان ئەداو بۆ ئەوەی ببێ بەقوڕێکی چاك ئینجا رۆژ بەرۆژ دروست دەکرا لەلای خواردوە کونێکی لێدەکرتا پاشان (ئاردو ساوار برنجیان) تێ دەکرد. |
| کەڕی | لەگوریس پانترە وادارێکی وەك ئەلقە پێوەیە پێ دەڵێن هێسی. |
| کارك | جۆرە پێلاوێکی کۆنە لەپیستە دروست دەکرا. |
| کەژاوە | لەکاتی وبوك هێنان، دەڕازاندرایەوە بۆ بووك . |
| کیسەلە | کیسلەش جۆرە گیان لەبەرێکە لەدەغل دەدات وشیرەکەی دەخوات وقەپێلکەکەی بەباتاڵی دەمێنێتەوە، لەشێوەی کیسەڵی ناوناوە، بەڵام رەنگەکەی بۆر وردشە. |
| کورك | ئەویش ئەخۆشیەکە بەزۆری تووشی گەنم دەبێت ئەویش چەند دەنکێك لەگولەکە، وەیاگوالەکان بەنیوەی رەش هەڵکەڕین لەشێوەی دەرمان رەشك وایە گەڵی نەرمەوزووش تۆزەکەی پەرت دەبێت ونوکی دەنکە گەنەکە دەکری ئەمنەخۆشیە تووشی ( جۆ)ش دەبێت هەروەك گەنم. |

| | |
|---|---|
| کەرەدان، کەرەشاخ | شاخی گیان لەبەرێکە کەهەندێك کەرەی تێدەکەن بۆ سوینی داسەکانی بەزلیە قەسەڵك جاربەجار چەندێکی لێ دەردەهێنرێت دەیخەنە سەردەمی داسەکانو هەسانی بەسەردا دەگێرن بۆ تیژ کردن. |
| کوندەی ئاو | پیستەی بزنە لەکاتی سەربرینا کەولێ ناکەن ودەری دەهێنن، یانی پیستەکەی لەناوەندرا شەق ناکەن بەڵکو بەهێمنی گۆشتەکەی لەپیستەکەی دەکەنەوە پیستە بەساغی دەمێنێتەوەو چەفت وپەلکە هەنارو مازی تێدەکەن و بەرغ دەکرێت و نەرم و شل دەبێت ودەغاریۆ ئاوی تێدەکەن بۆ سەپانەکانیان پڕ ئاویان دەکردو دەیان بردەسەر پەڕیز. |
| کۆگە | بەشوێنی داینشتنو حەسانەوەونان خواردن دەڵێ، و ئەو شوێنەی کەگشت کەلوپەلیان لێ دادەنێن. |
| کا | پوش و کلۆشی گەنمو جۆی وردکراو. |
| کوندەرانی پەرێزن | لەچەند باوەش قرشەپێك دێت بۆ لەناونانی کوندە ئاو ودۆدانەی (دۆ) بۆ ساردو فێنکی بەکاردێت، کوندەرانی دیش لەگوند هەیە دوودیواری بەقەد بەژنێك دروست دەکرێت دەبێتە دوونهوم و سەری دەگرن دار لەناو دیوارەکە رایەر دەکەنو پوش و پەراشی دەخرێتەژێر کوندەو ئاوە چۆرەکەی دێتە قەدی خواریێ. |
| کلدانە | بەو کونانەی ناوتۆپ (جەنجەرەکە) دەڵێن کە کلچوکەکانی حوشترۆکەی دەچێنە ناوو پڕ دەکرێت لەبەزو دوونگو کارەموو بۆ سوڕانی باڵتەکە هەرتۆپێك دووکونی تێدایە پێیان دەڵێ، کلدانە، کەبەهەردوو تۆپ دەکا چوار کلدانە. |

| | |
|---|---|
| کلچووکە | بریتییە لەچوار ئاسنی لووسی خڕ، پڕ بەکلدانەی لە حوشترۆکەکان بەندن بەسایەی کلکێکی تیژی باریك ودووفلیقانە لەلای دەردەی حوشترۆکە هەرسەرێکی بەلایەکدا نوشتایتەوە. |
| کیسەلە | بەوداره پشت کورە دەڵێن کەپشکەکانی کرتۆتە ناوەخۆی بەگوێرەی پشکەکان کیلیلەی لەسەر دروست دەکرێت و لە چەشنی پشتی کیسەلە(لەجیاتی کیلۆنی دەرگا بەکاردەهات). |
| کۆتك | لەشێوەی جامی ئاو خواردنەوەیە لەدار دروست دەکرێت بۆ دۆخواردنەوە بەکاردێت. |
| کەمەند | بریتییە لەگوریسێکی بەدوو پیاوبگیرێ. |
| کراس | لە(٥) گەز قوماشی نەزۆر تەنك بێ ونە نەستوور دەدروا بەتیرێژ قەرەکەی بەرکێشك دەدورا پێیان دەگوت (کراسی شکاکی)، ناوقەددکەی بەبشدێنی باریك لەناوقەد لەپشتەوە دەبەستن تۆزێك باغەڵی بچووکی دەبوو. |
| کەوا | لە(٥و ٣) سێ گەزونیو قوماشێکی نەستوری بەسیمی جوان دەدراو بەشەقەڵ یاقوماشی خامەکی مۆ رئینجا لەسەر کراسە کەلەر دەکرا جیاوازیەکی ئەوتۆی نییەلەگەڵ کەوای دەشتی هەولێر. |
| کراس لابڕ | لە(٥و ٤) چوا رمەترونیوقوماشێکی تەنك بەسیمی ناسك دەبڕا. |
| کەوا | لە(٣) مەتر قوماشێکی نەستوری ڕەنگاو و رەنگی گوڵدار |

| | |
|---|---|
| بەشەقەڵ | كەوایان دەدرووی دەگەڕیادوە سە رزەوقـی ئافرەتەكـەش لەگـەڵ جلوبەركەكانی. |
| كۆڵەگە | بەودارو كاریتەیە دەڵێن كەدەدرێتە بەرپردی كارتیەكانی، وەیا دەدرێتەبەر كاریتەی شكاوی خانوو. |
| كۆڵوانە | لـە(۱) مـەتر قوماشـی سـادەی تـەنك دوولای روخـەكانی گولینكەی بچوكی بەئارموشی ڕەشی بەسیمی سپی گولینگـە كەدەپێچرا هەشبوو رۆخەكمەی بەپرولكە دروست دەكرد. واتـە پولەكەی لێ دەدورێ. |
| كەوای بەلۆكە | بـەوەرزی زسـتانان ئافرەتـان كـەوای بەلۆكـەیان لەبـەر دەكـرد ئەوی ش بەریان لەكەوێكە دەداو هەندێ لۆكەیان لـەناو دەكـرد ئینجا خەت خەت دەیاندووری. |
| كۆڕیت | خانووێكی بچووكە، بۆ پەلەوەرو (مریشك) دەگرێت. |
| كۆر | لـەدیهات ئـافرەت دەچـنە دەرەوی گونـد بـۆ خۆشوشـتنو جـل شوشتن. |
| كاریتە | بەم دارە ئەستوورە دەوترێ كەدە هاوێشرێتە سەردیوار لەكاتی خانوو دروست كردن. |
| كورتەك و شەرواڵ | كورتەكو شەرواڵ لەسێ گەز قوماشی دەدروا كۆنترین مۆدیلی جلی كوردیە. |
| كراسی سپی | كراسـی سـپی لـەپۆلینی سـپی لەخەزنـەی دەیانـدووری بەئەنگوچـك یـان هەنـدێك جـار وەیـان دەدووری سەردەسـتی بەقوپچەو یەخەی كراسەكە بوزستانان پشت ملیان لـێ دەدوری بەهاوینان بێ پشت مل دەدورا. |

| | |
|---|---|
| کڵاو | دروستکردنی کڵاو بەزۆری لەخامەکی مۆر بوویان زۆر جارایش کەسك بوو بەزۆری لەدووچارە دروست دەکرا یەکیان خڕبوو ئەوەی دیکەیان درێژ پارچەکەی دەکەوێتە سەرسەری خر هەڵدەبرا، پارچەکەی تری چوار پەنجە پان و دووبست درێژ بوو، کڵاویش چەند جۆرێکی هەبوو .<br>١-کڵاوی سپی لەداوی پەمۆ دروست دەکرا.<br>٢- کڵاوی ڕەش‌و سپی پەمۆدەرێسن‌و بەداو لەگەڵ دەزووی ڕەش بەشیشکەی دەیانچنی بەنەخش ئەویش دەبوە کڵاوی نەخش دا رکوڕە جاحێلەکان لەسەریان دەنا.<br>٣-کڵاوی بەسیم ئەم کڵاوە بەقوماشی دروست دەکرێ.<br>٤- کڵاوی‌خوری لەخوری مەڕی دروست دەکرا، بەزۆری پیاوە بەساڵاچوەکان لەسەریان دەکرد. |
| کۆچك | بەوپارچە پەڕۆکە دەڵێن کە دەکرێتە سەری منداڵ لەبن گەردەنی بەداوێکی نیفوی کۆچکەی گرێ دەدرێ پارچە کەش درێژە هەتاپشتی پێی منداڵەکە دەهات (لەشێوەی چارۆگەی ئافرەتە). |
| کلێنە | کلێتە جۆرە کڵاوێك بوو لەخوری دەرێسرا، دەکرا بەداو ئەویش ژنان دروستیان دەکرد، تایبەت بوو بەکوڕە (جاحیلان). |
| کارکەچەم | لەپێستی چێڵ دروست دەکرا ئەم پێڵاوەش تایبەت بوو بە جوتیاران. |

| | |
|---|---|
| **کلاش** | پـەمۆیاخوری دەرێـــرا دەکـرا بـەداو، ئینجـا سـناعەتکار دروســتیان دەکـرد بنــەکی لاســتیقی ڕەش ئــەویش تایــەی ئۆتۆمبیلێ بوو سەرەکلاشەکەیان دەچنی لەوبنـەی کـەئامادەیان کردبوو بەسووژن دەیان چنی. |
| **کارك** | ئەم پێڵاوە بنەکەی لەپێستی حەیوان دروست دەکرا تـا سـەری کارکە کەبەئارمووش ڕەنگاو ڕەنگ سیمی سپی زەرد دەنەخشا ئەم پێڵاوە تایبەوت بوو بۆ پیاوە دەوڵەمەندەکان و ناودارەکـان بۆ زەماوەندو خۆشی لەپێیان دەکرد. |
| **کلاوتاس** | لەتاســیەکی زیــو یــانزێر لەدووھــەوری ســەوز وســووریان دوومیشـکی وکلاوێـك پێکھـاووە ئـەم دووھەوریـە بـەدەوری کلاوەکەوە دەپیچرێو بەقولابـەقایی دەکـەن، ئینجا تاسـەکە لەسەری کلاوەکە و دەدوورن. |
| **کەش** | زەوییەکە بـاران لێـدراو، کەقوڕنـەبێ بـەکاری ئـەوەبێت جـوتی تێدابکرێت کەش ھاتووە، واتەکاتی کێلانی ھاتووە. |
| **کەشك** | دۆی ووشك کراوە، شیوی گەنمەکوتایە. |
| **کەشکەك** | چێشتێکە لەبروشو گۆشت پێك دێت. |
| **کەف** | شتێکە سپی بۆش لەسـەر نـاو یابـەھۆی شـوردنی شـتەوە لـە سابوون پێدا دەبێت. |
| **کەڵبە** | دوو دەدانی درێژو سـەگو گـورگ وپشـیلەو شـێرو پـەڵینگ و بەراز. |
| **کێلگە** | زەویەکە بەکەڵك کێلان بێت. |

| | |
|---|---|
| کش | کشە، بۆ دەرکردنی مریشك بەکار دێ. |
| کزە | دەنگی سوتانی گۆشت. |
| کفن | پۆشاکێکە لەمردووی دەئالێنن. |
| کلۆر | بۆش، ناوبەتاڵ وەکو قامیش. |
| کوپە | گۆزەی گەورە. |
| کێلان | زەوی هەڵدەدرێتەوە بەگاسن و بێڵ. |
| کاژ | پێستی مار، وەکو کراس بساغی بەساغی خۆی دای ئەماڵێت بەبێ دڕان. |
| کاسە | دەفرێکە بۆ ئاوخواردنەوە بەکاردێت. |
| کالیار | ترۆزێیکە لەبرك نەکرابێتەوە وزۆرگەورە بوبی، و هەڵگێرابێ بۆتۆ. |
| کاڵا | پارچەیێکە بۆشاکی لی دروست بکرێت. |
| کانی | کانیاو، چاوگە، زەوێکە لەخویەوە ئاوی لێهەدەقوڵێ بۆ هەمیشە یالە بەهاردا. |
| کاوێژ | دەم بەیەکدادانە وەکو بنێشت جووین، یاکاوێژی حەیوان. |
| کوندە | بۆ سارکردنەوەی ناوبەکاردێ لەپیستەی بزن دروست دەکرێ. |
| کەرە | رۆن چەورێکە لەماستو شیر ئەگیرێت لەپاش ژەندنی بەمەشکە کەرەتا نەتویتەوە وپیسی ودۆیەکی نەگیری پێ نالێن رۆن. |
| کۆران | کۆلان. |
| کن من | لای من. |

| | |
|---|---|
| کەسب | کار، ئیش. |
| کلفەتان | هاوخەم. |
| کەلەك | تەرمی مردوو. |
| کەسافەت | هەژاری. |
| کێهان | کامە. |
| کە پوو | لووت، دفن. |
| کەناو | ئاودڕ. |
| کۆز | خاوخێزان. |
| کۆپە | بێ کەڵکە. |
| کار | پیشە، فرمان. |
| کاروان | قافلە. |
| کاروان سەرا | خان. |
| کاس | گێژ، وڕ، بێ هۆش. |
| کوچکە | گاشە بەرد، خڕکە. |
| کۆردە | سەرانەی ئاژەڵ. |
| کەلەش | لاشە. |
| کەسەر | غەم. |
| کوچاگر | بەو کوچکە بەردانت دەوری ئاگردانە دەڵێن کەمەجەل وشتی تری دەخەنەسەر ئاگری لەبندادەکەنەوە. |
| کز | نیوە وشك بونەوەیە. |
| کەساس | بێ نەوا، هەژار. |

| | |
|---|---|
| کەس | قەوم، کەسوکار. |
| کەس | سەوز، سەوزای . |
| کەش | کەژ، کێو، شاخ. |
| کەلەباب | کەلەشێر. |
| کەلەگەت | باڵابەرز. |
| کەمەر | پشت. |
| کرچ | سیس. |
| کزەبا | بای فێنك وسارد. |
| کوپ | فنجان. |
| کەزی | پەلکە، پرچی هۆنراوە. |
| کەسەر | خەم، خەفت. |
| کەندولەند | بەرزەو نزم. |
| کەوشەن | سنوور. |
| کەونەلان | کۆنەلان، مەبەست جێی ژوان. |
| کاباب | کەیبانۆ، ژنێکە گەورەی ماڵ بێت. |
| کادان | کایەن، جێگای کاتێکردن. |
| کار | کارژۆلە، کرژیلە، بیچوی بزن. |
| کارد | کێرد، چەقۆ. |
| کارەك | کالەك، گندۆرە. |
| کاشتن | کێلان، وەردەبرین. |
| کافرۆش | کەسێکە(کا) بفرۆشێ. |

| | |
|---|---|
| کاکڵە | ناوی گوێزی پاك کراوە. |
| کەر | کوێدرێژ. |
| کەت | چواریا، چارپایە. |
| کاکەڵە | برنجی کەڵەی پاك کراو پلاوی. |
| کاکیلە | چوار ددانن لەبنەوەکە کەوتن دەرنابنەوە. |
| کاڵ | کرچ، میوەی نەگەیشتوو. |
| کاڵا | پارچەیێکە پۆشاکی لێ دروست بکرێت؟. |
| کان | مەعدەن. |
| کانیاو | کانی، چاوگە، چەشم. |
| کە پەنەك | کەرەك، فەرەنجی. |
| کو | چۆن. |
| کیهان | کامە. |
| کوچك | بەرد. |
| کەنوو | بۆ هەڵگرتنی (نارد) بەکاردەهات، لە قوڕ دروست دەکرێت، بلندی بە باڵای مرۆڤێکە، لەخوارەوە پێچکەی هەبوو، لە بەشی خوارەوە لە ناوەڕاستیّ کونێکی بۆ دەکرا بەقەدەر دەست پیێ وەکونێك، بۆ نارد دەرهێنان، بە پەڕۆ دەگیرا . |
| کلك فس | جۆرە مریشکێکی کوردەوارییە، کلکی نییە، بە زۆری رەنگی قاوەییە (مریشکە کلك فسەکەمان مردار بۆوە)، مریشکە قوندەشی پێدەڵێن. |
| کوندەڵان | کوندە، کوونە، کوندەڵان ئەو شوێنەیە کە وەك سێبەرێك دروست دەکرێت بۆ دانانی کوندە و دۆدانە و جارجاریشی هێزەی روون. |

| | |
|---|---|
| **کولانکە** | خەلانکە، لە دەلاقە بچوکترە، بە زۆری خڕ دروست دەکریّ، ئەگەر رووی لە شەماڵ بوایە بایەکی فیّنك دەهاتە ژوریّ. |
| **کۆسەبەبە** | ئەو مرۆڤەیە کە سەرکردەی تیپی یاری بووکە بە بارانیّ دەکات. |
| **کووە** | چۆن، چاوان، چتۆ. |
| **کردبوویە خۆ** | خدووی پێوە گرتبوو. |
| **کزەکەی کرد** | گەڕانەوە بە دڵتەنگی، بیّ هیّز، خۆ کز کردن. |
| **کوسکە کوسك** | زەقە زەق، بریسکانەوە بۆ چاو. |
| **کشت** | توند، وشت، چوست، بە پەلە، (ئاوریّکی کشتی داوە). |
| **کوڕە کوڕ** | قەمبور، خۆ چەماندنەوە، خوار بوونەوە. |
| **کوندە** | کونە، لە پیّستی بزن دروست دەکرا، پاش غاراندن، ئاوی تیّدەکرا بۆ خواردنەوە. |
| **کەڕکە** | کەپەنگ، فەرەنجی، لە لوا بەرخ دروست دەکریّ. |
| **کەشکە نەژنۆ** | رەقی ئەژنۆ، کلاّوە چۆك. |
| **کۆرە ریّ** | باریکە ، ریّگای بچوك، بزنە ریّ، ریّگایەك کە زۆر لەمیّژە پیادەی پیّدا ناڕوا. |
| **کەبەر** | دڕکیّکی هاوینەیە، بۆ هەڕاشی خانووبەکاردیّ، بەریّکی هەیە پیّی دەگوتریّ(شەفەلە)، کەسیّك ماری پیّوە بدات ئەو بەرە بخوات باشە. |
| **کەتن کەر** | کەتن، مزیڕ، خراپە، زیان. ئەو کەسەی خراپەکاری دەکا |
| **کەیف و ماشا** | هەوەس، ئارەزو. |
| **کەودمری** | هیچ نەدیت، نەدیتکە، نەدی و بدی. |
| **کەسمان لە کەس** | پاکبوونەوە، هەرکەس بۆخۆی. |
| **کۆریس** | بزن و کارو تەگەو مەڕو بەرانی بیّ شاخ، بیّ قۆچ. |

| | |
|---|---|
| کارە کۆرپە | کارە ساوا، کاری بزنێکی درەنگ زێ. |
| کا پێلك | کەلەش، لەش و لار گەورە. |
| کڕ | کڕ بوونەوە، وسکت بوون، ژێر بوون. |
| کانێسە ستوور | ڕەزا گران، ڕەزا قورس،بە کەسێك دەڵێن لەبەر دڵان خۆش نەبێ. |
| کوڕیژگۆکە | بچووککراوەی (کوڕ)ە. |
| کۆتك | ئەو جام(بادیەیە کە لە دار دروست دەکرا، تایبەت بوو بە دۆ خواردنەوە. |
| کوچکەکە | خرکە بەرد، پلارە قسە. |
| کەرەمستانێ | یارییەکی کوردەوارییە شەوان دەکرا بەزۆری لەکاتی گەڕەلاوژەی جوانان، بریتییە لە (نۆ)کلاو، ئەنگوستیلەیەکی لەناو دەشاردرایەوە. |
| کە پوو | لووت، دفن. |
| کوز و شەشە | تیر و پەڕە، پڕ بە پێستی. |
| کێوە | بۆکوێ، بۆچ جێگەیەك، کیڤە. |
| کەترە | کە نەفت، پەککەوتە. |
| کەستەکە | ئەو خۆڵەیە کە ناو ڕەقی کردوە. |
| کۆزمرە | کوزر، ئەو گوڵە گەنمەی کە دانی تەواو لێ پاکنەراوەتەوە. |
| کێرمیز | نێرینە، ئەوەی توخمی نێر بێ. |
| کۆریت | ژوورێکی بچوکە لە لا چەپێك بۆ مریشك و پەلەوەر. |
| کسپە | کزە، کسپە، دڵ سوتان، دەنگی ئاو بە ئاگر داکردن. |

| پیتی(گ) | |
|---|---|
| گوڕ | ١- گوریه ئاگر، بلێسەی ئاگر.<br>٢- پەلامار، تاودان، گوڕی کردێ واتە پەلاماری دا. |
| گەردی بەیانی | کازیوە، تاریك و روونی بەیانی. |
| گێ فڕکانێ | جۆرە یارییەکی منداڵانەیە ئەوکەسەی کەیاریەکەی لەدەست، ئەگەر بیگەنێ گوێی رادەکێشن تا شتەکە فڕە نەدات گوێی بەرنادات دەڵێت گێی فەقیران رامەکێشن ئینجا شتەکە فڕە دەدات. |
| گڕناگە | مەراق، حەردەیەوێ- گڕناغەی لێ داگرت. |
| گەرش | ١- گرۆو، ٢- نۆبە. گەڕی تۆیە گۆرانی بلێی. |
| گەردوو وەرد | زەوی بەیاردوای باران بارین بچێندرێت پێی دەڵێن گەردو وەرد. |
| گەلۆر | توێری. |
| گەمبۆر | ناپیاو. |
| گۆردە | کەسێکە یارمەتی هەژاران و برادەرانی نەدات و هەمیشە کلکی ئاغا بێت. |
| گێژەن | شوێنێکە لەناوی رووبارو زێیەکان بەهۆی ئەوەی زۆر قوڵەو ئاو دەدزێت، هەمووشتێکی لێوە رادەکێشێت. |
| گاشە | گاشەبەرد بەردێکی گەورەیە کەمرۆڤ دەتوانێت رایبوەشێنێت گاشە بەردیش لە کوچکە بەرد گەورەترە. |
| گەمە | یاری، وازی. |
| گردکردنەوە | کۆبوونەوە. |

| | |
|---|---|
| گاز | دۆخ. لەسە رگازی پشت نووستیە. |
| گرناغە | سووربوون، گرناگە. |
| گەیی | پێگەیشت، بۆ مێوە بەکاردێت. |
| گۆتنگەر | ئاژاوە. |
| گێچەر | شەڕ پیفرۆشتن. |
| گرۆێر | ئەوپارچە قوماشەیە کەلەبن هەنگلی کراس‌و کەوێ دەبەنەوە. |
| گەڕ | گۆڕی، ریز، نۆبەت، گەڕی کێیە، گۆرانی بلێ، دەگرێتەوە، سەرجەم، خۆشی بۆ دوانە گەڕ لە هەمووانە. |
| گە | گرێی دەست‌و پێ. |
| گۆیان | لەدەست وەردان‌و بێ خێرکردن شێواندن، گۆیاندی واتە هەری پشێوا. |
| گوپ | کاتێك دەم پڕ ئاو یا پڕ هەوا دەکرێت روومەت بەرز دەبێتەوە لەوکاتە بەرووەمەت دەگوترێت گوپ، هەروەها بەرووومەتی پڕی منداڵان دەگوترێت گوپ، ئەو منالە گوپی خڕ. |
| گێشکە | لەبێژینگدانی دانەوێلەو فڕەدانی کوزەرەکەی. |
| گلێرە | دوای ئەوەی کوریکەی بڕکەی بێستان (گندۆرە، تەرۆزی‌و خیارو..) دەوری، ژێرەکەی کە لەدەنکە نوکێك گەورەترە، پێی دەگوترێت گلێرە. |
| گردبوونەوە | خڕبوونەوە، کۆبوونەوە. |
| گڕ | ١- دەست بەسەرداگرتن، ئەم هەوارە گڕدراوە.<br>٢- ددانی شاش، واش و گەورە.<br>٣- گوریە ئاگر-گڕی تێ بەربوو. |

| | |
|---|---|
| **گەوزین** | یەکێك یەکێك بریندار بێت و لەناو خوێنەکەی غلۆربێتەوە، ئەگەر گوێ درێژێك خۆی لەخۆڵ وەربدات. بریندار بێت و لەناو خوێنەکەی غلۆربێتەوە، ئەگەر گوێ درێژێك خۆی لەخۆڵ وەربدات. |
| **گاسنی تەختە** | (نۆژەن) ئەو گورەئاسنە خوشکردایەیە کەلەلای پشتەوەی لەچشنی نیو بازنەی خوارکراوەتەوەو زمانەی هەوجاری تێداگیر دەکرێ کەپێ دەڵێن کوپەی ئاسن، بەسایەی تۆپق وەیا بازنی گاسن نایەڵی زمانەی هەوجار بترازێ و لەگاسنەکە جودا بێتەوە. |
| **گەردووەر** | بەم جۆرە چاندنە دەڵێن کەیب رای کەشتیارمان شۆ یاوەردی خەبوود نەیتوانیوە لەپایزێ پیچشی باران پەرە تۆی بکات لەدوای بارینی باران وەیا پەرەکەتن دەیچینێ بەوە دەڵێن گەردووەر. |
| **گاز** | بۆ دابرینی بەری دوورنەیە سەرپاڵە هێڵێکی راست دەدورێ و قەدرو بەری پێ دیاری دەکات، بەرەکە جیاواز دەکات وە لەتەبارەکە بۆ دورین هەرچەندە قەدوبەر کورت بێت، هەندە سەپانەکانیاشە چونکە زۆر ماندونابن پشت راست دەکەنەوە. |
| **گێرە** | گێرە بریتییە لەدابەستانی چەند وڵاغ جا چ(گۆی درێژ) کەر، وەیاوڵاغی بەرزە (ئیستر) و(باگیر) و(ماین و ئەسپ) وەیا دابەستانی چەند (گایەك) لەتەنیشت یەکترو بەستن وەیان لەملی یەکتر چ بەرێشمەو قەراسە، چ بەقولفەی گوریس و لە مل کردنی وڵاغەکان. |

| | |
|---|---|
| | سەپانەکە وەیا( گێرەکەرەکە) گوریسێك لەملی، وەیا دەیکاتە دەست جەلەوی ولاغی(بنەی) گێرە. بەقامچی ولاغەکەی سەرەوە ئەوانی تر دەسورێنی بەسەر قرشەکە، هەتاوەکو جوان قرشەکە هوردەبێت و دەکرێت تارمەو شنە بادەکرێت و گەنم وکایەکە لێکتر جیا دەکرایەوە. |
| گەلاوێژ | لەدادانی چەند باوەشی گەنم پێك دێت بەمەرجێ گوڵە گەنمەکان بکەونە دەرەوە، وچنکە گوڵەکان بەهێزەو بۆ سۆر هەڵگەرنی گەنمەکەیە لە(٤-٥) ڕیزدادەنرێت. |
| گولە | بەپیاوێکی بەژن کورتو گچکە دەگوترێت. |
| گیشە | لەدادانی باوەشێ جۆپێك دێت، بەمەرجێ گوڵە جۆیەکان بکەونە ناوەوەی گیشە، لەبەر ناسکی و کێشانی(شێ)و قەڵ وبوونی جۆیە، چونکە جۆهێشتان نیمە تەری هەیە کە دەست دەکرێ بەدورینەوەی . |
| گرەگرە | (بەکرە) بریتییە لەدارێکی لولەی زمانە دەرهێندراو، بۆ بەندکردن وتێکهەڵکێشانی پێچکە شەغرەکان بەکاردێت درێژ یەکەی نزیکەی (٥٠-٦٠) سم دەبێت. |
| گوریسی شەغرە | بۆ هەر شەغرەیەك یەك گوریسی درێژ بەکاردێنن و دوو زەنگۆڵەی پێوە دەبەستن ویا دووگوریسی بەکاردێنن. |
| گۆێندە | بەحیران و لاوك بێژ دەڵێن، کەلەکاتی ژن هێنان وبەزم و رەزمی شایی لاوك و حەیرانومەقام دەڵێن. |
| گەرە لاوژە | کۆمەڵێك لەدەنگ خۆش و گۆرانی بێژ لەکاتی دانیشتنێکی تایبەتیدا هەموو بەشداری گۆرانی گوتندەکەن بەوشێوە گۆرانی یانە دەڵێن (گەرەلاوژە). |

| | |
|---|---|
| گورگەلۆقە | جۆرە رۆیشتنێکی وەکو راکردنە. |
| گاسن | گاسنێکی زلی دەم پانەو درێژ لەشکلی بێل، بەلاّم گاسن گەورەترە، دەکرێت زبانەی هەوجاردا زەوی پیێ هەڵ نەدرێ، و پیێ نەکێڵدرێ. |
| گەوارە | بارانێکە لەهەندێ جێگا بباریّ و لەهەندێ جێگانە باریّ. |
| گۆدرێژ | کەر. |
| گاز | بانگ. |
| گور | گوڵ. |
| گورمەلان | شوێنی سێبەروسارد. |
| گەڕی | گەلی. |
| گۆلم | چەنگ، ناودەست. |
| گازەرەی پشت | بڕبڕەی پشت. |
| گورمگومە | مەسینەی قاوە. |
| گاڕان | کۆمەلێك مانگا. |
| گاز دەکری | بانگی دەکرد. |
| گزیر | هەژار. |
| گراو | یار. |
| گابەرد | بەردی زۆر گەورە. |
| گەزە | قەپ. |
| گازگرتن | قەپ گرتن . |
| گامێشی | جورێکە لەلەش رەشە ولاّغو لەمانگا گەورەترە. |
| گەلور | بێکارە تەمبەل. |

| | |
|---|---|
| گلپە | بلێسەی ئاگرە. |
| گڕ | تاوو بلیسە ئاگر. |
| گران | قورس، بەنرخ. |
| گمە | دەنگ ونالەی کۆتر. |
| گۆ | شتی خڕ. |
| گوو | پیسایی ئادمیزاد. |
| گوپ | روومەت. |
| گوێزان | کاخرامان، چەقووی سەرتاشین. |
| گیان | رۆح، هۆی ژیان. |
| گیپەڕە | ئەستواری مل. |
| گێز | گوێز. |
| گێژ | وورِبیّ هۆش. |
| گیسك | کاری بزن لەتەمەنی یەکسالّیدا. |
| گێل | نەفام، بی ّعەقلّ. |
| گینگل | پێچ خواردنی مار. |
| گێلاس | ئالوبالو. |
| گەڕیدە | گەڕۆك. |
| گەوە | پێچی کێو. |
| گیشە | کە درویّنەی جۆ دەکرێت مەلۆکان کۆ دەکرێتەوە، لە شوێنێك لەسەر یەکی دادەنێن، گولّە جۆیەکان بۆ ناوەوە دەبن و پێی دەگوتریّ (گیشە)، هەرچی گەنە لە کاتی درویّنە مەلۆکان کۆدەکرێنەوە لەسەر یەك پێی دەلّێن (گەلاویّژ) گولّی گەنەکان بۆ دەرەوە دەچن. |

| | |
|---|---|
| گەز | پێوەرێکی جاران بوو لە جیاتی مەتر بەکار دەهات، ۹۰ سم دەبێ، پێوەرێکی ئینگلیزییە یەك (یارد)ە. |
| گیسك | کاری لە شیر براو، کار پاش چوار مانگ دەبێتە (گیسك) بەرخیش دەبێتە (کاوڕ). |
| گجیلۆکە | بچوك، گچکە، ورد، سوکەڵەی گچکەیە. |
| گروازە | لول، قژی گری گری. |
| گڕدان | دەست بەسەرداگرتن، کردنە هی خۆ، گەسك لە دەوروەدان. |
| گژ | خەریك، (دایکم خەریکی نان کردنە)، بە گژ داچوون، شەڕ پێفرۆشتن. |
| گۆراح خۆش | دڵخۆش، بە هەوەس، بە زەوق، بە کەیف. |
| گێلمە گێلم | چەند و چوون، گەمە و گاڵتە، (هۆ بابینە کابرا گێلمە گێلم نازانێ). |
| گۆد | گۆج، سڕ بوون. |
| گزوفت بدات | دیق بکات، تامەزرۆ، دڵچوونێکی زۆر. |
| گۆدە گۆد | ڕۆیشتنی نارێك، خراپ ڕێکردن، سست ڕۆیشتن. |
| گوردی مس | بزنی ناوچەوان سپی. |
| گردە بڕ | لە ناوەڕاستڕا، بەزۆری بۆ شکان بەکاردێ(دەستی منداڵەکە گردەبڕ شکا). |
| گەشکە | خوو، فێ، لەخۆچوون. |
| گزگل | کورتە باڵا، قوتە، بەژن کورت. |
| گۆڵمە | گۆڵم، پڕی هەردوو دەست بە وێك هێنانەوە و کورژکدنەوە. |
| گڕدان | هەڵکردنی ئوتومبێل، بەگڕ خستن، لێخوڕین، ئاژوتن لە کاتی هەویر ماڵین سەردتا گرش دەدرێ. |

| | |
|---|---|
| گوراح | کەیف، زەوق، هەوەس، دڵخۆش. |
| گەوز | ئەملا و ئەولا. |
| گەوزاندن | لەبنەخۆنان، هەڵگێر و وەرگێر کردن، جۆرە یارییەکە کوردەوارییە. |
| گاز | گاز کردن، بانگ کردن. |
| گاز | یەکەم دەست پێکردنی دروێنە. |
| گولتە | ئەو پەنایەیە لەسەربان دروست دەکرێ، یان پشت بەستی دیوارە لە ترسی کەوتن. |
| گۆڕین | جاران، پێشان(بەسەر دیوارەکەی گۆڕین هەڵگەڕا). |
| گیا نێر بوون | کاتێك کە گیا گوڵ دەکات و ناوی نامێنێ. |
| گرناگە | مەراق، حەز، ئارەزوو. |
| گورگە لۆقە | ئەرمە غار، هەروەلە. |
| گورگە لۆقە | هەڵاتنی لەسەرەخۆ، ئەرمە غار. |
| گاگۆڵە | یەکەم ڕۆیشتنی منداڵان لەسەر دوو دەست و پێ. |
| گورگە | لێوار، مۆرە، ئەو قوڕبەستە زیادەیە لەسەر ڕیزی سەرەوەی دیوار دادەنرێت. |
| گۆنگەر | گۆبەند، شەڕفرۆشی، تەشقەڵە، بەزمی شەڕ. |
| گێرە | کوتانی جۆخین، چەند وڵاخێك لێکدی جەلە دەکەن بەسەر جۆخین دەخرێن و لەسەر دەسورێن، ئەم کارە بۆئەوەیە کەجۆخین ئامادەبێ بۆجەنجەر کردن. |

| پیتی (ل) | |
|---|---|
| لەبەر | بۆ خاتری. لەبەر وی نەهاتم. |
| لچك | لایەکی چەفیە یان بەرامپیل. |
| لاچك | لاسکی گژوگیا. |
| لەچەك | چەفیە. |
| لەزمواتی نابوو | تەنگی پێ هەڵچنیبوو. |
| بۆگە | ئەو گیایە کەلەدەوروبەری ناوی وەستاو دەڕوێت |
| لاکێل | لاکێل ئەو زەویە یە کەجووتیار دەیکێڵێ و بەجێی دێڵێ، واتە لەم گوندە نیشتەجێ نابێ، جانەگەر هات ئەوا دەیدوورێتەوە، ئەگەر نەهاتیش بوو وازی لێدێنێت. |
| لەوچە | زۆر بلێ. |
| لەنکاوڕا | کتوپڕ. |
| لابیدە | بێگانە. |
| لامل | لاسار. |
| لێراو | بێلاڤ، بەفراو، بەمەرجێ بەفرکەی ناودکە زیاتر بێت. |
| لاترقەوچ | نارێك. |
| لەدوای داوە | بواری پێ داوە. |
| لات | نیشانەو دیارکردنی پارچە زەویەکە بۆ تۆدان وکێلان. |
| لەودە | بریتییە لەچوار دیواری بەقەدەر پێشتینەی زەلام دەبەستێت، دوو دیواری درێژە ئەو سەرکەش وەك خانووی جزیری بەسێ گۆشەی دیوارەکەی دروست کراوە درێژ وکورتی بەگوێرەی زۆری و کەمییە. |
| لۆلەپ | دارێکی لەمەشکە دەبەسترێ، بۆئەوەی نافرەت دەستی پێوە بگرێ، لەکاتێ مەشکە هەژاندندا. |

| | |
|---|---|
| لاجووتە | پارچە ئاسنێکە لەچەشنی پیشەقانە، بەڵام دەمەکەی نیو بازنەیە جوتیار بەکاری دەهێنێ بۆ گۆڕکردنەوەی گاسن و هەوجار بەتایبەتی لەجووت کردنی زستان و بەهاردا. |
| لەنگەری | دەفرێکە وەکو سینی پان لەدار دروست کراوە بۆ هەڵتەکاندنی دانە وێڵە. |
| لەوەڕ | شوێنێکە ئاژەڵی تێدا بلەوەڕێت خواردنی تێدا بخوات وەکو کژوگیاو پوش لەئاقاردا. |
| لوا | بەو خوریە دەگوترێ کەبۆیەکەمجار لەبەرخ دەکرێتەوە. |
| لوتکە | تەوقە سەری شاخ و کێو بەرزترین شوێن لەسەر شاخ و لق پۆپی درەخت. |
| لچ | لێو. |
| لۆچی | بۆچی. |
| لەیڵ | تەم، غوبار. |
| لازم | پێویست. |
| لات | هەژار بێ نەوا. |
| لەت | کەرتە، نیوە، پارچە. |
| لەتکە | شتی دووکەرت، وەکو لەتکەنۆك، لەتکەهەرمێ. |
| لەڕ | لاواز. |
| لەرز | لەرزوتا، ترس، لەرزە. |
| لەرزین | جمو جۆڵی ئەندام بە هۆیکەوە. |
| لەش | لاشە، ئەندام، بەدەن، جەستە، کەن. |
| لەشکر | سوپا. |
| لەغاو | دانە لەغاو. |

| | |
|---|---|
| لەف | پێچانەوەی شت وەکو جێگاردی لەف |
| لەق | شل |
| لەقە | جوتەوەشاندن یالێدانەببەپێ |
| لەقاندن | جولاندن، شل کردن. |
| لەموز | قەپۆز، دەم لچی ئاژەڵ، ئەو ئەنداوەی لەکاتی ئاو خواردنەوەدا تەڕنەبێ. |
| لق | چڵ، لق و پۆپی درەختو گژوگیا. |
| لم | چەوزیخ. |
| لینگ | قاچ، پێ لاق. |
| لۆچ | چرچ، گرژ. |
| لورە | دەنگی سەگ وگورگ وچەقەڵ. |
| لوس | بێ‌موو، ساف، فر. |
| لوژ | لۆش، زویر، مات. |
| لیتە | قوڕاو، چڵپاو. |
| لیخن | ئاوی پیسی و لێل. |
| لێزمە | رەهێلە بارانی توند، تۆق. |
| لێزماو | لافاو. |
| لیس | لیسک، لیزگ، هیلانەکردنی پاساری بەکۆمەڵ. |
| لێسانەوە | زبان بەشتدا هێنان. |
| لێشاو | زۆر زەبەنە. |
| لیف | لیفە. |
| لیفە | لفکەی خۆشوردن. |
| لیک | ئاوی دەم. |

| | |
|---|---|
| لینج | شتێکە بنوسێت بەیەکدا وەکو چرێش. |
| لێوار | کەنار، قەراخی شت، زروار. |
| لێوان | سەرپڕ. |
| لیویان | لێهاتن، ژان کردن |
| لگەن | قاپی گەورە، لەنگەری، دەفری گەورە. |
| لە گن | لە لای، لە پەنا کنە من، لای من. |
| لپر لپر | لۆچاوی، گرێ گرێ، دەم و چاوێك کە زیپکە و قینچکەی زۆری لێهاتبێ. |
| لە کودیلەی دڵیەوە | لە هەموو دڵیەوە، لە ناخیەوە. |
| لە نکاوڕا | لە پڕێکەوە، لە هیکڕا. |
| لە شروان | لە خەفەتان، لە حەژمەتان، لە سوێیان، لە خەمان، لە تاوان، (لە شروان لە هەناوەوە دەکوڵێ). |
| لە حەژمەتان | حەژمەت، داخ، سوێ، ئێش، خەفەت، کەسەر، خەم. |
| لۆ | بۆ، بۆچی، (ئەوە لۆ فێرە نان کردن نابی؟). |
| لاڕمشە | تیراوە، نەخۆشییەکی ئاژەڵانەیە. |
| لەوغە | دەنگە دەنگ، گاڵە گاڵ، هەرا هەرا، زۆر برێ، هاتوو هاوار. |
| لەزگ بوو | خەریك بوو، زۆری نەمابوو، (لە زگ بوو لە زروکە بدات). |
| لە عۆدەشی نایەت | دەرەقەتی نایەت، لە توانای نایەت، پێی ناوەستێ، دەرهەقی نایەن. |
| لۆی مەیسەرنابێ | مەیسەر نەبوون، جێبەجێ نەبوون، رێکنەکەوتن. |
| لە سەرین | لە جیاتی، لە باتی، لە بری، (لەسەرینی پەنجە گەستنم دارکاری دەکەم). |

| | |
|---|---|
| لایین | لێرە مەبەست (مستەر لایین)ە لە ساڵی (١٩٣٤)زەوی بەسەر ناغاکانی کوردستان دابەش دەکرد. هەروەها ساڵی (تەوسیە)شی پێ دەگوترێ. |
| لە حیددەتان | لە تووڕەییان، لە قەهران، لە حەژمەتان. |
| لە گوپ دان | گوپ، لا روومەت، کە دەم دادەخرێ و پڕ دەکرێ لە(با)، لە گوپدان بۆ کەسێ بەکاردێ کە نەتوانێ کارێك ئەنجام بدات. |
| لاگر | لالووت، دووشك، تەرەفدار. |
| لە ئەشکی خۆیدا | گەڕایەوە بێ ئەوەی هیچ جێبەجێ بکات. |
| لەزگە | لەوانەیە، خەریکە، رەنگە، (لە سوێیان لەزگە دیق بکەم). |
| لەخرتۆرێ وەردان | لە زەوی کوتان، لە خۆڵ وەردان، لە بنەخۆنان (بۆ شەڕو دەستەگەمە بەکاردێت)(کاوە غەنیمەکەی بڵند کردولە خرتۆرێی وەردا). |
| لە قارچەی ژورێ | بنەبان، لە قولینچکێ ژورێ، لە تاریکایی ژورێ. |
| لە بینەو بەستاندای | بینەو بەستە، تێکەو لێکە، سەین و بەین، مامڵەت، لێرە پتر بۆ کاری خراپ و فرت و فێڵ بە کار دێت. |
| لە قەوام | قەوام، توانا،(ئەو خواردنە لە قەوامی من دا نیە). |
| لشمە لشم | فینگە فینگ، گریان، نیوە گریان. |
| لێم دەربوو | کەوتە قسان، زمانی گەڕا، (هەرچەندە لێم دەربوو چی خراپ بوو گوتی). |
| لە حەژمەتان | حەژمەت، خەفەت، رق، لە حیددەتان. |
| لەمگێز | لەرەقاز، بەتام، خۆش. |
| لەتامی رەتدا | لە حەد دەرچوو، بێ تامی کرد، گەیشتە زندەی، تێپەڕاندن، زێدەڕۆیی کرد. |

| | |
|---|---|
| لای نەهوونتر بوو | نەحوونتر، ناسانتر، خۆشتر، سەختتر، دژوارتر، ئازارتر،(مردنی لە لای نەحوونتر بوو لە گریان ). |
| لنگی دایێ | پڕی دایێ، پڕ کێشی کرد، هەڵیکوتایە سەر. |
| لە هیکەوە | لە نکاوڕا، لە پڕێکا ڕاچەنین، موچرکە. |
| لامل | کەللە ڕەق، عیناد، بۆ کەسێکەکە خراپ بێتە ڕایێ. |
| لەواشە | فاق، کەرستەیەکە لە دوو دار پێکەوە گرێدراو پێکهاتوە، نالبەند، لە کاتی نالکردنی ولاخی چەمووش لە هەردوو لچی سەرەوە و بنەوەی دەبەست تاکو لەبەر ئێشو ئازار نەتوانێ خۆی هەلدا. |
| لەبەرت دەڕوا | بۆت دەلوێ، بۆت دەڕەخسێ، (هەرچی بکەی لەبەرت دەڕوا). |
| لە هێزە گرتن | هێزە چەشنی کوندە و مەشکەیە لە پێستی بزن دروست دەکرێ، ڕۆنی مەڕی خۆمانەی تێدەکەن، کەسێك بکەوتایە یان هەلدێرابوایە، یان بە لێدان ئازاری هەبووایە، بۆ نەرم بوونەوە لە هێزەیان دەگرت. |
| لات | پارچەزەوی خەت بۆڕاکێشراو، لەکاتی تۆکردن زەوی دەکرێتە چەندلاتێك، بۆئەوەی لەتۆدان لێیان تێکنەچێ. |
| لچیان کردن | دەرخواردیان داوە، بە کەسێکی بەرتیل خۆر دەگوترێ. |
| لێهاتن | نەخۆشییەکی کوشندەیە، بەزۆری بە کولکی گەورە دەگوترێ (لێهاتن). |
| لەودە | کادێن، لۆدە، لە دەرەوەی ئاوایی دروست دەکرا لە چەشنی خانوێك. |
| لەمە چێتر | ئەجندە، جنۆکە. |
| لۆ شیوێ | بۆ شیفێ، بۆ نانی ئێواران. |
| لەوچە | سوورتك، منجڕ، قسەنەزان. |
| لە قیست دەچێت | قیس، کیسی، لە دەستت دەڕوا. |

| پیتی (م) | |
|---|---|
| مزموره | جۆرە چێشتێکە جاران لە ناهەنگی بووك گواستنەوەی چێشتی مزەورە دەدرا نافرەتان وپلاّو ساوارياپراغ دەدرا پیاوان. |
| مەراق | ١- مێگز، تامەزرۆ، نارەزوو- مەراقمە بچمە ناگرێ. ٢- خەم، پەژارە- ئەوەندە مەراق لە برایە چەپرا غەكەت مەخۆ. |
| مرخ | تەماح، چاولێبوون، مرخی لێ خۆشکردیە. |
| مروده | بەحەزرەت، قاندرِ، خوپێوە گرتووە. |
| مشەومش | نیگەران. |
| مۆن | کارێکی بەدکرابێ و بەچاویەوە دیار بێت، چاوی چەندبەتایبەتی بۆ منداڵان. |
| موچرك | تەزین، راچلەکین- رۆستەم موچرکی بەلەشی داهات. |
| مقەسە | جۆرە رووەکێکە بەهاران دەروێت، بنکەکەی دەخورێت و لەشێوەی سەرەکی قێز بەلەو پیفۆك و شیلمشاقە. |
| موکڕ | سوور بوون. |
| مشتومڕ | کێشەو خەفەت و هەشت. |
| مشت | پڕ. |
| مشت و ماڵ | پڕ لەسەر لێوان. |
| مات | مەلول، حەیران و سەرگەردان. |
| مەنگۆز | تەرەس، قسەیەکی ناشرینە بەیەکێك دەگوترێت کەباباشی نەجولێتەوە. |

| | |
|---|---|
| کانذی | ماندوو، کفت، لەفارسی (ماندە، کوفتە) دەگوترێت. |
| مرپەند | سەوردە، لەبر بەند هاتووە، ئەو شتە چەندبەهێزە دەڵێی مرپەندە . |
| مۆرە | نەوقورە خوساو پر لەکایەیە کە دەخرێتە دوارێزی خشتی حەوشە گردانو کردنە مولك لەیاری منداڵان، مۆرە مۆرەم لێداوەکەس دەستی لێ نەداوە. |
| مرودە | هۆگر. |
| ملەومز | مله ستوور، بەمرۆڤی بەخۆوە دەگوترێت. |
| مشتومر | حەفت و هەشت، کێشە، شەرو هەرا. |
| ملهور | کەللە رەق. |
| مردۆخ | تەمبەڵ لەکارو جوڵانەوە. |
| مژانە | دارێکی ئەستووری درێژیردۆڵە، تزیکەی دوومەتر دەبێت وەك کاریتەیە هەردوو سەرەکەی چەند کونێکی تێدایە لای هەورازی بۆ ئاو(بۆسە) زەنگولەی نیرەچێت بەسایەی سەرمژانکە لەنیرەکە بەند دەکرێ، سەرەکەی تری لەگەڵ باسکە هەوجار توند دەکرێ بەچەندسنگی دار یاناسن کەپێ دەڵێن خەپە، واش دەبوو چەند تۆقی ئاسن وەباسیق لێ دەدراو توند دەکرا. |
| مەرەغان (مەراغان) | لەشێوەی داسی دوورنەیە، بەڵام دەمو دەسکەکەی گەورەو درێژە بۆ دوورینی گیاو گۆڵی سەر قادە تا خۆشەکانی (چیا) و زەمەندەو دەو ئاوەکان بەکاردێت لەترسی زیندەوەر ئارێکی شوێن بەم جۆرە دروست کراوە. |

| | |
|---|---|
| مەدۆ (مەلۆ) | چەند سوارەیەکە خڕ دەکرێتەوە سەرەیك لە(١-٤) سوارە پێ دەڵێن (مەلۆ). |
| ملەی سەپان | لەگەڵ کۆمەڵە سەپانێکی تر چەند سەپانێك وەیا دووسەپان دەبووە (رکەوملە) لەدوورنەکرندا، مەرجیان دەکرد کەپشت راست نەکەنەوە هەتابەرتەواو دەبێت وەیا هەتا چێشتانێ زۆر جار کەلەکار دەترازا(سەپان) پشتیان راست وەکردەوە هەتا ئەوسواردو باوەشە دوراوانە رەوانەی گوند دەکرانەوە لەگوندیش ژنان دەیان کوتاو گەنمەکەیان بەدەستار دەهاڕیو دەیان کردە هەویر نانو ئەستورك دەیان هێناوەسەر پەرێز ئینجا سەپانەکان پشتیان راست دەکردەوە ئەوستورکەیان دەخوارد. |
| مرووموٚ | گەڕان و سوڕان وبۆنکردنە بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنی . |
| مێشکە | بەرخی سوا کەدایکی بمرێ پێ دەڵێن (مێشکە). |
| ملەجەلحە | جەلحە شێوەی جەرەیەکی بچووکە وملی باریکە جوتیار ئاوی پێ دەباتەسەر زەوی بۆ خواردنەوە. |
| مادە | ئەساس و بنەڕەت و بنچینە بۆ دروستکردنی هەموشتێ (هەوێن). |
| مانگابیرە | کاتێ نیوڕۆ لەبەهاردا کەگاگەل دێتەوە بۆ ئاوایی بۆ حەوانەوەو دۆشین. |
| مانگابەکەڵ | مانگایە کە هاتبێتەکەڵ وکەڵەگای زۆری بەدواوەبێت. |
| مجرۆ | کوێر بوونی ونەدیتنی چاوە. |

| | |
|---|---|
| مەشێرموە | ونی مەکە، پەنای مەدە. |
| مەحس | داوی لەچەرم دروست کراوە. |
| مەفتەن | وڵات، وەتەن. |
| مەجلیس | کۆڕی دانیشتنی پیاوان. |
| مەجیدی | دراوێکی زێڕی سەردەمی عوسمانییە. |
| مەیت | تەرم، لاشەی مردوو. |
| مەیدان | گۆڕەپانی جەنگ. |
| میگەل | رانەمەڕ، یابزن. |
| مجێور | بەوکەسە دەڵێن کەخزمەتی مزگەوت و چاك و پیرە مردووەکان دەکەن. |
| موچڕك | راچە نینێەکی کورت. |
| میرابی مل | دەورەی مل. |
| مێردمزمە | حنۆکە، ئەجندە. |
| مالوس | بەرازی مێیە. |
| مار | ماڵ. |
| منداز | نیشان. |
| میمی | پور خوشکی دایك یاخوشکی باوك. |
| مەشکۆرە | مەشکە بۆ دروست کردنی کەرەو دۆ بەکار دێت. |
| موشەجەر | گوڵدان. |
| مانقول | پیاوی لێوەشاوە، پەسند. |
| میرخاس | کەلەمێرد، پیاوی ئازا، جوامێر. |

| | |
|---|---|
| مرۆ | مرۆڤ، پیاو، زەلام، مەردوم. |
| مەزن | گەورە. |
| مەزهەب | رێچکە. |
| مەنزیل | هۆدە، خانی. |
| مەلۆکێش | کێشکەر، تێلە کێش. |
| مەشغول | خەریک. |
| مەلیان | تەژی، پڕ. |
| مەرام | مەبەست. |
| مۆر | نیشانە، شەقل. |
| ماچە | هێستری مێنگە. |
| مارانگاز | مارانگەستە، کەسێکە مار پێوەی دابێت. |
| ماف | حەق. |
| ماکەر | دێلەکەر. |
| ماڵ | دارایی، سامان، مار. |
| مامر | مر، مریشك، مرنج، کەمرگ. |
| مان | قین، رِك کەیەلگرتنی چارەوێ. |
| مانگۆر | گەورە کچ، کەنیشکە عازەب، مانگۆر. |
| مانگۆ | ماندو هیلاك. |
| مایینە | مێیینە، دژی نێرینەیە. |
| ماووس | نەشکەنجە، حەرکەمان، خەرکەوان. |
| ماڵ لەیەك | هاوماڵ، هاوبەش. |

| | |
|---|---|
| مالۆكەن | ماڵ بڕ. |
| مالنج | سواغ دان. |
| مالین | گەسەك دان. |
| ماڵ ومردان | بەهارە وەهار، بەوكاتە دەگوترێ كە خاوەن مەڕو شوانكارەكان لە گوندو لادێیەكان، بارگەو بنە تێكدەنێن و بۆ ئەو شوێنانەی دەچن كە لەوەڕگای تێدابێ، شوێنی ڕەشماڵی بەهارانە . |
| مات | مەزەندە، (ماتی بۆیەك و بیست و سی دەچێ) . |
| مقەیەت | هۆشیار، ئاگادار. |
| مل تورلی | (تورلی)، باڵندەیەكی ئاوییە، مل و لاقەكانی درێژو باریكن، هەر كەسێك ملی باریك بێت پێ ی دەگوترێ مل تورلی یان (مل بامیە)شی پێ دەڵێن . |
| مۆرووی شین | لەپكەی شینی حەفت كونە. |
| ملەوەز | بەتین، گەوە، زەبەلاح، بەخۆوە، ئەفرەجا. |
| مۆنجە | قەرەباڵغی، ئاوەدانی زۆر، ئاپۆرە. |
| مۆرە | چینەی دیواری قوڕ، هەر دیوارێك لە پاس تەواو بەرز كردن، لە سەرەوە مۆرەی بە قوڕە پەست بۆ دەكرا. |
| مەجوومەوە | جوین، كاوێژ كردن، قسەی دووبارە كردنەوە، زۆر لەسەر قسەیەك ڕۆیشتن، (چیدیكە ئەو قسانە مەجوومەوە). |
| مڕ بوون | تێر خواردن |
| مێراب | ڕۆخ، لێوار. |
| مرخێش | بینە و بەردە، هێنان و بردن، راكێش راكێش. |
| مەعلاندن | مەعلان، لێزان، فێر بوون، راهێنان. |

| | |
|---|---|
| مزاش | تێکەلکردنی گەنم و جۆ بۆ کردنی بە ئارد. |
| مەعلاندن | دەرسدان، لێ راهێنان، (ئەو دەیزانی چۆنی مەعلاندابن). |
| مخەنەت | دڵ رەش، بێ ئەمەك. |
| مەشکانی | دانانی خشت لەسەر دیوار بە مەرجێك بەرینی دیوار بە درێژی خشتەکە بێت. |
| مەرگەمووش | ژەهر، زەهر، ژار. |
| ملی بۆ نەهێنابەرێ | سەری بۆ دانەنواند، سەری بۆ شۆڕ نەکرد. |
| مۆزە مۆز | کوڕ گەیشتە هەرزەکاری(مۆزە مۆز دەکات)، دەورەدانی ژن. |
| مێشە کەرانە | نێرە مێش، مێشی گەورە، مێلش ردش. |
| مەیسەر نابێ | پەیدا نابێ، جێبەجێ نابێ، رێك ناکەوێ(لەو دەمەی بۆم مەیسەر نابێ). |
| مەعن | مەنع، قەدەغە، رێپێنەدراو، بێ رەزامەندی. |
| مەعبێنمان | نێوانمان. |
| مەکرووفە | کوفرە. |
| مۆنجە | سیرە، ئاوەدان، قەڵەبالغ. |
| ماتە | خۆشی، بجێز، نیشان، گمیو. |
| مەساسە | لاپوتە، لەپیشەقان بچوکترە. |
| متووی | متوو/ خوو، حەز، متووی/ خوودان، خوو پێوەگرتن. |

| پیتی (ن) | |
|---|---|
| نارەحەت | هەڵسوکەوتی خراپ، چەتورن، کابرایە نارەحەتە. |
| نیوەچڕ | ناتەواو، کارەکەی بەنیوەچڕی بەجێ هێشت. |
| نان هەربژێرمە | جۆرە چێشتێکە بریتییە لە مەنجەڵێك ئاوی گەرم کەمێك روون و خوێ و ئاوی تەماتەی تێدەکرا ئینجا نەوپەلکەنانانەی چەند رۆژ لەمەوبەر کەنەخورابوو تێدەکرا ئە چێشتەش هەربۆ خاتری خەسنەبوونی نانەکە سازدەکرا. |
| نخون | وەرگێران، ئاودیو کردن . ئەو مەنجەڵەی نخون بکەوە. |
| ناورانەوە | پاراەوە، نوزانەوە. |
| ناوقەد | کەمەر. |
| ناگزوور | گوزەرانی خراپ. |
| ناوسێری | ناوساجی. |
| نابوت | ناتەواو. نا + بود- بوت (هەبوون)نەبوونی لەشێکی رێك. |
| نەتە | ورە، نەتەی بەردایە، واتە ورەی دابەزیوە. |
| نەدیتکە | مرۆڤی دواکەوتوو و بێ خەبەر لە پێشکەوتن. |
| نەوسن | کەسێکە بەردەوام حەز بەخواردن بکات. |
| نیر | دارێکی راستی لوولەییە، درێژی یەکەی بۆ ئێسترو وڵاغ بەرزە نزیکەی (٤و ١) م دەبێت، بۆ گوێدرێژ(٢٥و ١)م دەبێت چوار کونی تێدایە دوولای راست و دووشی لەلای چەپ پێیان دەڵێن کونی دارکرداوە دوو داریشی لەناوڕاستا چەسپاوە کورتن بەینەکانیان نزیکەی (١٢-١٥) سم دەبێت بۆ راگرتنی هێرتەیە کەپێی دەڵێن (دار خەزنە) وەیا (دووکونێ نێر) وەیا (کێروشکە) بۆ ئێستر وڵاغ بەرزە دەبێت وبۆ گوێ درێژ (٢٥و ١) م دەبێت. |

| | |
|---|---|
| ناوبەڕ | دابڕینی پارچە زەویەکە لەکێلگە لەبەر چەند هۆو گەڕانەوەی جوتیاربۆ کێلانی بەپارچە پارچەیی ئەم زەویە تاوەکو هەمووی تەواو دەکات. |
| نەقیزە | بریتییە لەبزمارێکی تیژ ئەکرێت بەسەرلوتی دارێکەوە بۆ لێ خوڕینی وڵاغ وگۆی درێژ، زەختە. |
| نزیکەگا | سەرمژانەکە لەکونی دووەم یاسییەمی مژانە بەلای خوارەوە ئەویش مات دەبێت، بەڵام وڵاغ ئەزیەت نادات لە کێلانی زەوی، چونکە گاسنەکە ناکەوێ. |
| نەمام | درەختێکە ساوا بەریشەوە هەڵکەنرابێ بۆ ئەوەی لەشوێنێکی تر بنێژرێت بۆ سەوز بوون. |
| ناسکەنان | دروستکردنی ئەستورکە بەسێر بکەرەو روونی مەڕ چەور تەڕێ دەکەن، هەنگین یاشەکری بەسەردا دەکەنو دەخۆرێ خواردنێکی زۆر بەتام وبەبەهایە لەکوردەواریدا. |
| ناودۆک | دارێکە بەدرێژایی مەشکەیە، بەسەرسکی مەشکەدا دەپێچرێ لەگەڵ هەردوو لۆلەپەکاندا. |
| نزار | نسار قەد شاخێکە هەتاو نەیگرێتەوە بەزۆری سێبەربێ . |
| ناعور | چەرخێکی لەچاڵییەوە ئاوی پێهەڵئەگوزرێت بۆ بەرزی بۆ سەرکشتوکاڵ. |
| نافەك | بەینی دوولنگەو دەرپێ ودەمەڵ قۆپان. |
| ناڵ | ئەوپارچە ئاسنەیە بەبزمار ئەدرێ لەژێر سمی چاردوێ. |
| نەزۆك | ئاژەڵ، یاژنێکە قسربێت واتە نەشۆربێ سك وزا نەکات و منداڵی نەبێ. |

| | |
|---|---|
| نێچیر | ئەوشتەبەراوچی لەشکاردا بیگرێ وبیکوژێ. |
| نەبان | ئەوحەیوانەی بەچکەی خۆی ناناسێتەوە. |
| نامۆی | بێگانەی، نەناسی، غەریب. |
| ناگزور | نارەحەت. |
| نالوێ | رێك ناکەوێ ناگونجێ. |
| نەشەمزاوە | رۆژی پێ ناکەوتووە. |
| نقە | دەنگ، پخە، نکە. |
| ناق | قورگ، بینە قاقە. |
| ناقر | نیوە چل، کاری ناتەواو. |
| نامەد | نەهاتی، نەگبەتی بێ بارانی، قاتوقڕی. |
| ناوبژی | نەهێشتنی جەنگ (سولح). |
| ناوپشتە | بنچینە و رەگەز. |
| ناوچە | ناحیە. |
| ناومالّ | پروپاتالێ ناومالّ . |
| ناوین | سواغ، ساوین، تلانن. |
| نەبات | جۆرە شەکرێکە بۆدەرمان بەکاردەهێنرێت. |
| نەبەرد | ئازا نەبەز، لێ هاتوو. |
| نەتەوە | نەوە، رۆلّە. |
| نەخت | نەقد، کاشی. |
| نەخش | نەقش، وێنە، رەسم. |
| نەدار | نەدارا، گەدا، هەژار، بێ نەوا. |

| | |
|---|---|
| نەدامەت | پەشیمانی. |
| نەدی بدی | تازەپیاکەوتوو، تازە دەوڵەمەند. |
| نەژاد | رەگ وبنچینە. |
| نەساز | نارێك ناهەموار. |
| نەسۆز | پایەدار. |
| نەسیم | بای فینك. |
| نەعل | پاپۆش، پێڵاوی سەرپێیە. |
| نەفت | نەوت. |
| نەفەس | هەناسە. |
| نەفەقە | گوزەران دان، بژێوی. |
| نەقل | گواستنەوە. |
| نەگبەت | بەدشانسی، بەدبەخت. |
| نەگریس | قیرسیچم، لاسار، بێ گۆی. |
| نەنك | نەنە، دایکی دایك، یادایکی باوك. |
| نەنگ | ریسوایی، عەیب و عار. |
| نەنگین | رسواو بەدناو. |
| نەوە | رۆڵە، رۆڵەی رۆڵەنەوە. |
| نەومرس | تازە پێ گەیشتوو. |
| نەوسن | چلێس. |
| نەهاتی | بێ بارانی قات و قڕی گرانی ووسك ساڵی. |
| نەخۆشی | بیمار. |
| نەوین | نابینا، بێ سۆما، کوێر. |
| نرخ | قیمەت، بەها. |

| | |
|---|---|
| نواندن | نیشاندان. |
| نواندن | خەو لێ خستن. |
| نوڕە | نوڕەی سەگ نوزە. |
| نوستن | خەوتن. |
| نۆش | خواردنەوە، نۆشکردن. |
| نۆکەر | خزمەتکار، پێ کورە. |
| نۆماڵ | تازە ماڵ. |
| نوێ | تازە، نفت و نوێ . |
| نوێن | پێ خەف. |
| نیاز | هەوس، ئارەزوو. |
| نیان | نەرم نیان لەسەرخۆ. |
| نارەنار | گۆرانی گوتن بەدەنگێ ی کپ وغەنگین. |
| نواڵە | جێگای نەرمان وبژهەێنی چیا |
| نەفرەجا | گەورە، زەبەلاح، زل. |
| نوردی | تویشە، زاد، چەند نانێك(شوان، گاوان، جوتیار، سەپان، رێبوار) هەڵی دەگرن. |
| ناورانەوە | پاڕانەوە، نوزانەوە، کروزانەوە. |
| نەورایی | کەندەلان، شوێنی نزم، هەردەشتێك کە چواردەوری بەرزایی بێ. |
| نکار | لە نزیك، لە رۆخ، لەکن. |
| نەقیزە | زەختە، هەر شتێکی نوك تیژ بێ بۆ کەر ئاژوان. |
| نیر | ئەو دارە درێژەیە کە مژانکە و سەرە مژانکەر ئەقرەبەی لێ دەبەسترێت، درێژییەکەی لە ئێستر و کەر جیاوازە، چوار کونی تێدایە. |

| پیتی (هـ) | |
|---|---|
| هێرە | دکرد، هێرەی پێکرد. |
| هێنکەبڕ | پشتی بڕ. |
| هەرمیشك | جۆرە خواردمەنیەکە. |
| هەپۆك | جۆرە گیایەکە بەرەکەی لەشێوەی وشیە ترێیەو دەخورێتو کاتی دورنەی جۆ پێ دەگات بەزۆری لە چیای قەرەچوغ دەبیندرێت. |
| هیشکە هەرقەن | ئەوزدوییە بەر لەباران بارین تۆ بکرێت، هەمیشە ئەو دەخلە گیای زۆر دەینی. |
| هەرێ | پەیان، سۆز، هەرێی پێدام سەری مانگێ هەزار دینارم بداتێ، بەلێن . |
| هەرکەو | قۆرتە ئاوی سەربەردی چیا، دوای ئەوەی باران دەبارێت، ئەو بەردانەی ئاویان قۆلە پڕ ئاو دەبن، ئینجا شوانان ئەم قۆرتانە بەتاشە بەرد دادپۆشن ئەودك ئاژەڵ بیخۆنەوە یاپیسی بکەن، جا شوانان بەمەبەستی خواردنەوە ئەو ئاوانە. |
| هەنجن هەنجن | پارچە، پارچە، منداڵەکە ئەوکراسەی هەنجن هەنجن کرد. |
| هەروستە | کەمێك راوەستان لەجولەیا لە قسەکردن. |
| هێرنج | بێزلێبونەوە. |
| هەرکوروزا | نیوە برژاوە، سوتانی سەرەوەی موو. |
| هورە | ئاگا، خۆی لەهورە برد، خۆی بێ ئاگا کرد. |
| هەنگران | زۆر دەوڵەمەندبون، زۆر خواردن. هەند دەوڵەمەند بووە هەنگرایە یاهەندێ خواردیە هەنگرایە. |

| | |
|---|---|
| هێور | لەسەر خۆ، ئارام. |
| هێور | لەسەر خۆ، ئارام. |
| هەرمێن | شتێك كڕیاری زۆر بێت |
| هەرا | ئاژاوە. |
| هەروێژنین | لول دان. |
| هەنجن هەنجن | پارچە پارچە هەلا هەلا. |
| هەراش | ١- بڕێك گەورە، باخۆش مندالێ لەخەم رەخساو.<br>٢- ئەو پوش و گیاو قامیش وكفرو شەواشینكەی لەسەر كاریتەو شەقرە دادەنرێت لەسەر گرتنی خانوو. |
| هەنوكە | نوكە، نها، ئێستا. |
| هەند گاوێ | هەرئێستا، وێگاوێ ڤێگاڤێ. |
| هەومنتە | بەخۆرایی. |
| هەرێ | پەیمان و سۆز. |
| هۆرتە هۆرتە | هوردە هوردە، لەسەرخۆ، سالدانە سالدانە، یا پشێ پشێ، هۆرتە هۆرتە، گەڕایەوەیاغر، یاغر. |
| هەش | جۆرە روەكێكە لەچەشنی توورو چەوەندەر دەكرێتە خەم و جلی پێ رەنگ دەكرێت قوڕ، هەشت بەسەری چۆن سەردەكەوی. |
| هورێنە | مرۆڤێكە بەهۆی نەخۆشی ئاگای لەخۆنەمێنێ و قسەی بێ سەروبەریكات. |
| هەرنە هوت | جۆرە بۆنێكی ناخۆشە. |
| هەشتاو | بەپەلە، سالخۆك زۆر بەهەشتاوی هات. |
| هیشكاووز | بەوتزوە جۆتە دەلێن كەلەپایزان دەكرێ وپێش بارینی باران ویەرەكەوتن. |

| | |
|---|---|
| هاوێر | بریتییە لەجیاکردنەوەی (مەڕو بزن) لەگەڵ کاروبەرخ پاش تێبەردانو مژین. |
| هۆدانەوە | لەسەرکۆتایی خالّی سەر سەدە جوتیار هۆدەداتەوە دەگەڕێتەوە. |
| هاونیر | یەکسانی هەردووولاغە دابەستراوەکانن لەبەرزونزمیدا. |
| هەسان | ئەوبەردەلوسە لاکێشەییەکەپانیەکەی نزیکەی (٦)سم ودرێژیەکەی (١٥-٢٠) سم دەبێت، بۆ سوینی داسەکان وتیژکردنیان بەکاردێت. |
| هۆدە | بریتییە لەچوار دیواری بەقەدر پشتێنەی زەلام دەبێت، دوودیواری درێژە ئەوسەرەکەش وەك خانووی جزیری گۆشەی دیوارەکەی دروست کراوە درێژو کورتی بەگوێرەی زۆریو کەمی دەبێت. |
| هوردەکوت | دووەم پلەی کوتینی قرشە شکێنە وبەلای چەپی پیێ یەکدا وەردەگێردرێ، (رەندی جوخین). |
| هۆزەبانە | ئاهەنگ و خۆشی، داوەتی لەدایك بوونی منداڵە. |
| هەوار | شوێنی هەڵدانی رەشماڵی بەهارانە. |
| هەوێن | بەویەك دوومڵاکەماستە کەلەشێر دەکرێ بۆ هەوێنی ماست هەوینی بەنیرشی هەیە لەکلێنەجەو کندۆرەو چەند شتی تر ئاغل ئەو خانووەی مەڕی تێ دەکەن. |
| هۆڵ | ئاغل ئەوخانووەی مەڕێ تێ دەکەن. |
| هات | وەرزی بەپیت و فەڕ، ساڵی بەپیتو دەغڵ و دانزۆر، دژی نەهات. |
| هاریی | نەخۆشییەکە تووشی گیان لەبەریا نادەمیزاد دەبێ کەسەگی هارگازی لگرتبێ. |

| | |
|---|---|
| هەوێز | بریتییە لەوشوێنەی کەمێگەل تێدا رادەگیرێ ولێدە دەخەوێ . |
| هارِین | وردکردنی شتو کردنی بەئارد. |
| هەچە | وشەیەکە بۆلێ خورینی گوێ درێژ بەگاردەهێنرێ. |
| هەرەس | رووخانی کەژوکێو، هاتنە خوارێ بەفری زۆر بە کۆمەڵ لەشاخەوە. |
| هەراش | گەورە پێگەیشتوو دەغڵ ودانی هەراش. |
| هەرەت | کات وەخت، گەنەکەهەرِەتی دروەیەتی. |
| هەمەجێ | ئەو جێگایەك کەبۆی دەچن. |
| هەجەل | ئەجەل کۆتایی ژیان، هاتنی مەرگ، کاتی مردن. |
| هاوێز | دابرِان، جیاکردنەوە. |
| هەرتۆقێ | شەق ببات. |
| هەرتە | سەرلێشواو، پەرگەندەبوو. |
| هەنی | تەختی نیو چەوان. |
| هەنابردن | پەنابردن، داوای پارمەتی کردن. |
| هەناسەبرِکێ | هەناسەسوار بوون، هەناسە تەنگ بوون. |
| هۆرینە | دەربرِینی چەند وشەیەك تاوی گەرم و گرانێ نەخۆشیەکە لەزمانی نەخۆشەکە. |
| هەرپەنما | هەراویستا، هەلاویسا. |
| هورە | تەمێکە چ لەگەرما چ لەسەرمتادا بەسەرلوتکەی کێوانەو پەیدا ئەبێ. |
| هەتوان | دەرمان، مەلهەم. |
| هەش | قوربەسەر، هەش، ماتەمبار. |
| هاژە | دەنگی ئاوو باڵی پەلەوەر. |

| | |
|---|---|
| **هاوپشت** | برا. |
| **هاوینە هاوار** | کوێستان. |
| **هەرەت** | کات، وەخت کەئەکە هەرەتی دەردویەتی. |
| **هەسارە** | ئەستێرە. |
| **هەگبە** | خورجین. |
| **هۆ** | ووشــەیەکە جوتیــار بــەکار دەهێنــێ لــەکاتی جــووت کردنــا بۆگەرانەوەی گاجووت لەسەر هێلەوە. |
| **هێل** | خەتی جووت. |
| **هۆدە** | ژوور. |
| **هەمبانە** | لە پێستەی گیسك و بزن دروست دەكرا كـەوڵ دەكراو دەغـاردرا، ڕەنگدار بوو، زەخیرەی گەنم و جۆو نیسك و نۆك و مـاش و سـاوارو بـروش و شـتی دیكـەی تێـدا خەڵـدەگیرا دەركـی بەبـەنی كشـت دەبەسترا، لەسەر هەرزاڵە دادەنرا . |
| **هەرزاڵە** | کەپر، ئەویش وەکو ئەستێرك بوو بـەڵام هـەرزاڵ بـە زۆری زەخـیرەو دانەوێڵەی لە هەمبانان لەسەر دادەنرا. |
| **هیر** | بەخت، شانس، یەخبال، (هەتا بڵێی هیری باشە). |
| **هەنۆب** | جارێکی دیکە، دووەم جار، کەرەتێکی دیکە، پێدەچێ ئـەم وشـەیە لەناو زمانێکی تر هاتبێتە ناو زمانی کوردی. |
| **هەوەڵ کەرەت** | جاری یەکەم، لە سەرەتا (هەوەڵ کەرەت باوەڕیان نەهات). |
| **هۆ بابینە** | ئامرازی بانگ کردنە بۆ کۆمەڵێك. |
| **هۆ باب** | ئامرازی بانگ کردنە بۆ کەسێك. |
| **هەترەش** | زراو، زەندەق. |
| **هەڵەکە سەما** | جۆرە یاریەکە، سەما و شایشی پێدەڵێن، لـە هـەردوو (دڵتـەنگی و خۆشی ئەنجام دەدرێت). |

| | |
|---|---|
| هاوارە بەلۆ | جۆرە ئاوازێکە بە شمشاڵ دەژەندرێ. |
| هەڵدەکارا | حەسودی پێ بردن، ئیرەیی پێ بردن. |
| هەڵاوێر | هاوێر، لێکدی جوایەز کردنەوەی مەڕ و بزن لەگەڵ کار و بەرخ. |
| هڕیان کرد | هڕ پڕدان، غار، شاڵاو، هوڕژم، هڕیان کردێ، پڕیاندایێ. |
| هەڕو گیف | گەف، ترساندن بە قسە، هەڕەشە کردن. |
| هەتەرەی نەکرد | قسەی نەکرد، نەدوا، وسکت بوو، متەقی نەکرد. |
| هۆی داوە | دووبارەی نەکردەوە، گەڕانەوە لەسەر سەدە بە زۆری بۆ جوتکردن بە کار دێت. |
| هەڕمان | زڕان، (تا سپێدە هەر گەوزم دا خەوم لێ هەڕمابوو). |
| هەیپەی لێ کرد | یاللای لێ کرد، بەڕێ کەوت. |
| هوڕە | بای رۆژهەڵات، بای گەرمە، بەپێچەوانەی بای ڕێژنە، لەزستاندا ئەگەر بای هوڕەی بێ باران نابارێ. |
| هەرزەلین | ساتمە کردن، رووچون. |
| هەتەرە | دیتن، بینین (هەتا چاو هەتەرەی دەکرد سەوزایی بوو). |
| هەرقوش | کلاو قوت، عاردبە رەش، بەر حوشتر نەانە جۆری گندورەن. |
| هەراش | گەورە، مێرد منداڵ، هەرزەکار، بەو دارو شەقلەو کاریتەو گیاو گۆڵە دەوترێ کە دەخرێتە سەر خانو. |

| پیتی (و) | |
| --- | --- |
| واق ورماو | حەپەساو. |
| ورات | وڵات لەدەشتی هەولێر تەنها بە ناوچەی کوێی دەگوترێت (وراتی کۆیی)، زۆر جاریش دەگوترێت وراتت بەقوڕێ بگیرێت، زۆر جاریش لەبیتوێن بەناو ماڵ دەگوترێت ورات. |
| وەسمە | شتێکە وەکو خەنە، ژنان ئەیکەنە سەریان، لەگەڵ خەنە بەکاردێ ڕەش کردنی مووی سەر. |
| وولاغی بەرزە | ئێستر و باگیر ئەسپو ماین دەگرێتەوە. |
| وەحە | وتەیێکە بۆلی خورێنی رەشە ولاغ و بەکاردەهێنرێت. |
| ومرین | کەوتنە خوارەوەی بەری درەخت بۆ بن درەختەکە یادانە وێڵە بۆ سەر زەوی وبن ساقەکەی. |
| ومردانەوە | لەبەهار دەست پێ دەکات بۆکوشتنی هەموو جۆرە میکرۆبێکی زیان بەخش، ئەویش لێدانی گاسنی درودمینە لەدوای شۆبرین بۆ پەسندی وەرد. |
| وشی | کۆکردنەوەی ئەو گوڵەگەنمو جۆیانەیە کەلەکەلەنی پێی سەپان بەردەبێتەوە وەیا لەگەڵ وەیا لەگەڵ دورینا دەپەرێت وەیا شکاندنەوەی داوەرە بەجێ ماوەکانن. |
| واز | وازهێنان، دەست هەڵگرتن، دەست بەردان. |
| واق بوون | سەر لێ شێوان سەرسام بوون. |
| وەچە | نەتەوە، ئەوڵاد. |
| وەخت | کات، سات. دەم. |

| | |
|---|---|
| وەرز | وەرزی ساڵ. |
| وەرزڵی | وەرزیار، پاڵە، جووتیار، دوەوکوە، دردوان. |
| وەرە | حەپەی سەگ. |
| وزن | سەنگ وکێشان. |
| وەزنە | تەغار، (٣٠) روبە. |
| وەشاندن | تۆوشاندن، تۆبلاوکردنەوە بەسەر زەوی یاجوتە وەشاندنی وولاّغ. |
| وەلام | وەرام. |
| وەلە | بۆڵی خورێنی گوێرەکەیە. |
| وتار | وتن وێژێژ قسە. |
| ووڕ | گێژ. |
| ورینە | قسەکردنە بەدەم خەودوە. |
| ورگ | هورگ، گەرگ، سك، زگ. |
| وردبین | زانا، دانا. |
| وردەفرۆش | وردە واڵە فرۆش. |
| وردە وردە | کەم کەم، تۆزە، تۆزە. |
| وورتە | نقە. |
| ورمێ | روخسەت، ئیجازە. |
| ورە | توانا، تاقەت. |
| ووڕە | گڤە. |
| ووریا | هوشیار. |

| | |
|---|---|
| وورشە | بریقە، بریسکە. |
| ووژش | هۆش، بۆ راوەستانی گویدرێژ. |
| ووشە | وتە، واتە. |
| ووشتر | هوستر، حوشتر. |
| ووشکە ساڵ | سیاساڵ، ساڵی رەش، دژی تەردەساڵە، واتە ساڵی بێ بارانو نەهاتی وقاتی گرانی. |
| وولاّخ | حەیوان چاڕوێ، رەشە ولاّغ. |
| ون | گم بو، نادیار. |
| وێل | سەرگەردان، هەڵە، بەرەڵی، رێگاووشکردن، سەرلێ تێك چوون. |
| وریست | بێزار. |
| وڵسات | بە هەموو وولاّخی بەرزە دەگوترێ وەك (ئەسپ، ماهین، هێستر) . |
| وردو هەڕا | وردو خاش، هەپرو بە هەپرون. |
| وەك تۆپ | زۆر باش، چاك، تۆپ هێمایە بۆ باشی. |
| وارەوار | هێدی هێدی، لەسەرخۆ، بەکاوە خۆ، یاغر یاغر، بە هێمنی، یاپشێ یاپشێ. |
| وەردێنە | نەخۆشییەکە تووشی چاو دەبێت، بەزۆری تووشی چاوی منداڵ دەبێ، لە تۆز و خۆڵ و بەد خۆراکی پەیدا دەبێ. |
| واژی | ئاوەژوو، هەڵگەڕنەوە، لێککردنەوە، بەردواژی کردن، هەڵدانەوە. |
| وەکات | تەئکید، دڵنیا بوون، رەپ و راست (سبەی وەکاتە دێمە لات). |
| واریقات | بەسەرهات، رووداو، سەرهاتی. |
| ولاّش | هاورێ، دۆست، برادەر. |

| | |
|---|---|
| وچاخ کوێر | بێ نەوە، بێ منداڵ، بێ وچاخ، بە ئافرەتێک یان بە پیاوێک دەگوترێت کە نەوەیان نەبێ و ئاگردان کوێرن. |
| وەك جەزبەی گرتبێت | جەزبە، هێدمە. |
| وەرد | ئەو زەوییەیە کە لە بەهاردا شۆبراوە بۆ کوشتنی گیا و گوڵی زیان بەخش و لە کاتی تۆ کردن گاسنێکی دیکەی لێدەدرێ. |
| زیندە ماڵ | گیانلەبەر بە گشتی، هەموو ئەو شتانە دەگێڕێتەوە کە لە ماڵدا زیندوون، (مەڕ و ماڵات ... هتد). |
| زار | زمان، (ئەوەی زاری لەدەو دایە). |
| زەرگە زەوی | گیایەکی بەهاری خۆڕسکەلە چەشنی پیفۆك و کەنگر. |
| زۆرە زۆڕ | دەنگی بڵند (حەمە زۆڕە زۆڕ دەگرێت). |
| زراوبردی | زراو، زەندەق، ترس، ورە. |
| زدی | زد، دژ، لایەتی. |

| پیتی (ی) | |
|---|---|
| یەك هێشە | وەردێکە یەك جار کێڵرابێ. |
| یەغبار | شەنس، بەخت. |
| یەدوك | ئەسپێکی زیاددیە سوار لەگەڵ خۆیان ئەیباو جارجار لە جیاتی ئەسپەکە ی تر سوار دەبێ. |
| یاخە | میسگ وبەرۆك. |
| یەساوڵ | یاساوڵ، پاسەوان، یارسول، نیشککر، نۆبەتدار. |
| یەکانە | بەرازی نێرەکە بەتەنیا بگەڕێ. |
| یەڵدا | درێژترین شەوی ساڵ. |
| یا | بۆ دوورخستنەوە دەکردنی چاردوێ بەکار ئەهێنرێ. |
| یابوو | بارگیر ئەسپی ژێر بار. |
| یاسمین | گوڵێکی زۆر بۆن خۆشە. |
| یخ | ئەمر کردنە بەو وشە بۆ حەیوان. |
| یەك رکێب | رکێب، پێ، راستەوخۆ، غار. |

# سوود لەو سەرچاوانەوەرگیراوە


* داستان و گۆرانی فۆلکلۆری کوردی – عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی
* فەرهەنگی کشتوکاڵ (١–٢) مەعروف قەرەداغی مەردۆخی.
* لیرەیەك لەگەنجینەی نەتەوەی کورد– ئەسعەد عەدۆ
* گوڵێك لەرەوسەی فۆلکلۆری کوردی– داود شەرۆل
* لاوك و سترانی کوردی– یاسین حەسەن گۆران
* لەگەنجینەی کوردەواری– مولود قادر بێخاڵی
* راوشکار– حەوێز حاجی ئیبراهیم ئاغا دزەیی
* رەسەن– ژیان هاوار ئیبراهیم دزەیی
* پیرە هەولێر– پیرداود مەخموری
* گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر

